## ناسنامه ی کتێب


- ناوی کتێب : گه شتێک به نێو گوڵزاری دیوانی ( ناڵی ) دا
( پیدا چونه وه ی ۱۶۸ شیعری دیوانه که )
- گه‌شتیار : علی محمد رضاوندی ( باپیر )
- ناشر : مولف
- تیراژ : ۲۰۰۰
- چاپ یه که م تاوسانی ۱۳۸۱
- حروفچینی : منصوری
- ویراستا[illegible]صوری
- ۹۶۴ - ۰۶ - ۱۶[illegible]

ISBN 964[illegible]

قیمه‌ت هه‌زار تمه‌ن

# «خودا راستە و لە راستیش خۆشی دێ»

زۆر دەمێکە لە نێو ئێمەی کورد دا بووەتە باو و دەگوترێ: «خودا راستە و راستیشی خۆش دەوێ».

من بە پێ‌ئەرکی سەرشانی خۆم ـ مەگەر بۆم نەلوابایا، ئەگینا ـ بە حەوتە پازدە رۆژ، یان پتر، دەچوومە خزمەت مامۆستای هێژا و هەرگیز لەبیرنەکراوم مامۆستا «هەژار»، یان بە تەلەفوون ئاگامان لە یەکتر دەبوو.

دوای ئەوەی ئەندامانی بڵاوکەرەوەی «سەلاحەددین» لە ورمێ، بێ‌دەبەر چاوگرتن و ئاگادارکردنی خاوەنی ماف، لە چاپدانی کتێب و نووسراوەکانی خەڵک، وەکوو هێندێک لە کتێب‌فرۆشەکانی وڵات، دەستیان کرد بە لە چاپدانەوەی دیوانی «نالی»،کە مامۆستای تێکۆشەر و بەوەج و پایەبەرزی کورد، مامۆستا «مەلاکریم» و کورە بەئەمەگ و شەکەتی‌نەناسەکانی، زۆریان خۆ پێوە ماندوو کردبوو و بەرهەمەکەیان گەیاندبووە ئەنجام و مافی لە چاپدانەوەیان بۆ خۆیان پارێزتبوو، منیش چوومە بنکەی ئەو ناوەندە لە تاران و یەک دوو، کتێب و نامیلکە و شتی وام لێ‌کڕین.

با ئەوەش لە بیرنەکەم، من لە کاتی خوێندنی فەقێیانەتیدا لە ساڵەکانی ۱۳۳۰ بەم لاوە، زۆربەی هەڵبەستەکانی مامۆستا «نالی»م لە بەربوو، بەڵام هەرلەبەرمبوون و چی‌کە!؟ چونکوو واتای زۆربەیانم نەدەزانی!

دوای ئەوەی کە هێندێک لە زاناکانی هەریم و ناوچەی موکریان، کاریان لە سەر کرد و نووسراوە دەستنووسەکانیان دەگەڵ ئەوەی مامۆستا «عەلی موقبیل»کوردستانی دا هەڵسەندگاند و لێ‌کۆڵینەوەیەکیان دەس‌پێکرد، منیش شتێکیان لێ حاڵی ببووم. سەرەڕای ئەوەش دەسنووسێکی کۆنی «مەلایەحیا»

ناوێک لە سەرشیو، دەگەڵ • هێندێک هەڵبەستی هونەرانی دیکەش، لە ساڵەکانی ۱۳۵۳ و ۱۳۵۴/دا، لە تاران وەدەستم کەوت. سەرلەنوێ سەرنجێکی دیکەی هەڵبەستەکانم دا. دوای لێکدانەوە و بەراوردکردنیان بۆم دەرکەوت، بە هۆی ئەوە کە ماموستا «نالی» وەک ئاوبازێکی زۆر کارامە و پسپۆڕ، لە زریای قووڵی وێژە و زمانی فارسیشدا، کە پتر لە کتێبخانەیٚ بەنرخ و بەوەجەکەی میرانی بابان ـ کە بە داخەوە ئینگلیسیە خوێنڕێژەکان، لە کاتی هێرش بردنە سەر شاری قارەمان پەروەری سولەیمانی لە ساڵی ۱۹۲۴ زایینی دا، بەزەییان بە مانەشدا نەهاتەوە و وەکوو کەژوکێوەکانی کوردستان ئاگریان دان و کردیانە خوڵەمیش و وەکوو مافی نەتەوایەتی گەلەکەمان بە دەم بای نەمانەوە، بە خاکە پیرۆزەکەماندا بڵاوکرانەوە! ـ کەڵکی وەرگرتبوو. بە هەستی زانستی خۆی، وشە واتادار و چەند لایەنەکانی لێ هەڵبژاردبوو و وەکوو دوڕ و مرواری خستبوونیە نێو لێزگەی هەڵبەستەکانیەوە.

ئەمەلەلایەکەوە، لە لایەکیترەوە لە سەردەمی ماموستا و کوڕەکانیدا خوێندن و خەریکبوون لە کوردستانی ئەو دیودا بە زمانی فارسی لە باو و بڕەو کەوتبوو. وشەنامەکانی زووش بە لایانەوە زۆر نەبوون و زۆربەی ئەو کەسانەش کە هەڵبەستەکانیان بە دەس نووسیوەتەوە و ماموستاش، کەڵکی لیٚوەرگرتوون، هەروەها چونکوو لە زۆرینەی وشە کۆنەکانی فارسی باوی سەردەمی ماموستا «نالی»، و ئەوانی دیکەی وەکوو «موستەفابەگ»، و «سالم»، و ... ئاگادار نەبوون، واتا و بنەڕەتی ئەو وشە و هەڵبەستانە بەباشی نەزاندرابوون و گەلێک وشەی وەکوو وشەکانی «نەی سەوار»، «قامیش سوار»، «شەپیووی شاپوور»، و ... کرابوونە «نەیسیار»، فەرماندەی سوپا، «شەپیووری شاپوور»، و ئەم جۆرە شتانە.

ئەوە بوو کاتیٚ رۆیشتمە خزمەتیان و ئەم بابەتەم راگەیاند، فەرمووی :

«بیانخوێنەوە و مانایان بکە». چەند هەڵبەستێکی دانستەو هەڵبژاردەم بۆ خوێندەوە و کاتێ مانام کردن، فەرمووی: «راست دەکەی! با شتێکت پێبڵێم، نەزانینی دیوانی «نالی» بۆ کەس عەیب نیە، بەڵام ئیدیعای زانینی، بۆ هەمووکەس عەیبە، چونکوو بە راستی «نالی» هەر خۆی زانیویەتی و بەس»!

ئەوسا بڕیار درا، ئەم هەرز بۆچوونانە وەکوو زنجیرە بەرنامەیەک ئامادەکەم و پاش چاوپێکەوتنی مامۆستا بیدەین بە گۆڤاری «سروە»، گۆیا کاک«ئەحمەدی قازی» ـ کە زۆر نەبوو بەخەیاڵ شوێنی مامۆستا «هێمن»ی گرتبوو* ـ چاپیان بکاو ئەم شنگڵە لە خۆی دا!...

---

* مامۆستا هێمن لە رۆژی ۲۸ / ۲ / ۱۳۶۵ کۆچی هەتاویدا، لە ورمێ، وەفاتی کرد. پاش ئەوان سەربەرستی گۆڤاری «سروە» کەوتە ژێر دەستی کاك «ئەحمەدی قازی»یەوە. ع.م.د.

هەڵبەت مامۆستاش پێی گوتبوو. وادیاربوو لایان وابوو کە ئەوەش «ئەڕای پەزەیل زیان دیری»! خرا پشت گوێ و هەروا مانەوە*!

تا ئەوەی کە ڕۆژێک برای بەڕێز و خۆشەویست، مامۆستاعەلیموحەممەد ڕەزاوەندی گەڕووسی، ـ کە ئەوانیش وەک ئێمە، هەستیان بە کەم و کوڕی و ناتەواوی و هەڵە و جێگۆڕکێی هێندێک لە واتا و وشەکانی نێو دیوانەکە کردبوو ـ رایان گەیاند: شتێکی وا لە واتا و هەڵبەست و واتاکانی دیوانی «نالی»دا، بەدیدەکەم و دەمەوێ کاریان لە سەر بکەم. منیش شتەکەم بۆ گێڕایەوە و زۆرم پێخۆش بوو کە ئەو کارە باشە دەس پێبکا و بە ئاکامی بگەینێ و بە مەلەباسکەی هەوڵ و تێکۆشان، خۆی بهاوێتە نێو ئەو زریایە و بتوانێ سەردەربێنێ و بە بیری هرز و بۆچوونەوە قووڵ هەڵمالێ و بە پێی توانا، هەڵەکان هەڵگرێتەوە.

بەراستی دەبێ بڵێم زۆر کەلێنی بەتاڵی نەزانراوی دیوانەکە، بە دۆزینەوەی ئەو وشە واتادار و هەڵبژێردراوانەی کە مامۆستا «نالی» ـ وەکوو دوڕناسێکی بە ئەزموون لە نێو لێزگەی ملوێنکەی بێوێنەی مرخ و پەسەندی خۆیدا لە جێگەی دیاری کراودا دایناببوون. بەڵام لە بەرپێی نەزانینی واتاکانیان، بەدەس ن ووسەر و کۆکەرەوەکانەوە، لە شوێنیخۆیان ترازان و شوێنەواریان نەما ـ پڕ کردوەتەوە و نزیکەی ۲۰۰ هەڵبەستی داوەتە بەر خنجەری لێتوێژینەوە و گەلێک واتای جوانی دەگەڵ ئاماژە و دیاردەکردن بۆ هێندێک زاراوەی تایبەتی

---

** ئەمن خۆمیش حەوت ساڵ پێش هەندێ لە هەڵەکانم، دا بە ناوەندی «سەلاحەددین» – هەرچەن بەرپرسی دەفتەری ناوەندی لە تاران بووم – بەڵام پشت گوێ خرا! باپیر.

زانستەکانی سەردەم و باوی ئەو کاتەی نێوان ماموٚستا و چازانەکانی ئێمە کوردی، دوٚزیوەتەوە و مەبەستی، شی کردووتەوە و واتاکانی لێکداوەتەوە.

دیارە ناکرێ بڵێین مەبەستی ماموٚستا «نالی» لە هەڵبەستەکانیدا هەرئەوە بووە و بەم لێکدانەوە، قوڕی بنی زریای واتاکان هاتوەتە دەر و ئاوی نوکتە دەبەرچاوگێڕاوەکانی بەگشتی، بەم کارە بایەخدارە هەلگوێزراوە و چوڕاوی لێ براوە. بەڵام بوٚ زوٚربەی واتاکان و دوٚزینەوەی وشەکان و ئاڵوگوٚڕێک وا بەسەریاندا هاتووە، زوٚرباش مەبەستی هەڵبەستەکانی روون کردوەتەوە. بە چەشنێکی وا، خوێنەر دەتوانێ بە باشی لێ حاڵی بێ و کەڵکی لێ وەربگرێ.

بەو هیوایە خودا دەوامی بدا و بتوانێ بەسەر ئەوانیکەشدا، بڕوا و بەم چەشنە، دەسکەگوڵەگەنمێکی دیکەی هەوڵ و تێکوٚشانی خوٚی، بهاوێتە سەر خەرمانی زانست و کەلەپوور و کلتووری گەلەکەیەوە. دیارە چاوەڕوانی ئەو هەوڵانە لە هەموو روٚڵە کوردەکانی دیکەی ناوچە جوٚربەجوٚرەکانی وڵاتە خوٚشەویستەکەمان دەکەین. بوٚ ئەوە باشتر بتوانین بەرهەمی رابوردوەکانمان بپارێزین و بە خەڵکی دیکەش راگەیەنین و بڵێن: ئێمەی کورد لەو بوارانەش دا، پێناسەی خوٚمان پێیەو لە خەڵکیتر، جێ نەماوین. ئەوە بووین و ئەوەشین!

هەر سەرکەوتوو بن، برای دڵسوٚزی گەل و نیشتمان،

عەزیز موحەممەد پوور داشبەندی. تاران ۵ / ۴/ ۱۳۷۹

۲۰۶۹ ک.

## بە نێوی خودای مەزن!

## پێشەکی

دەگەڵ ئینتشاراتی «سەلاحەددین»ی ئەییووبی، هاوکاریم بوو و جارجار نامەم بۆ ناوەندی ئەو ئینتشاراتە دەنووسی و هاوکاریم دەکرد. هەندێ وشەم بۆیان ناردبوو کە لە «هەنبانە بۆرینە»دا نەبوو. تاکوو ڕۆژێک نامەیەکیان بۆ ناردم. ویستبوویان کە لەگەڵیان هاوکاری بکەم و لە تاراندا بەرپرسی دەفتەری مەرکەزی ئەو ناوەندە بە ئۆدە بگرم. دەفتەری مەرکەزیمان لە تاران دامەزراند و وردە وردە نووسەرانی کوردی دانیشتووی تاران، ئاگاداربوون کە دەفتەری ناوەندی سروە لە تاران کراوەتەوە. پاشان لەگەڵ ئەو خۆشەویستانە ئاشناییمان پەیدا کرد. ئەگەر پێشنیار، یان ڕەخنە، یان مەتڵەبێکیان ببوایا، دەمناردن بۆ ئینتشارات لە ورمێ. جگە لە ئەو ئاڵوگۆڕی شێعر و نووسیارانە، بڕیارمان دا، حەوتەیەک جارێ، کۆ بوونەوەمان بێت، کە بوو.

ڕۆژبەڕۆژ دۆستایەتیمان، پەرەی دەستاند و مەحکەمتر دەبوو.ڕۆژێک لەو کۆڕە دۆستانە، باسی دیوانی «نالی» هاتە پێش و قووڵی شێعرەکانی. بەتایبەت لێکۆڵینەوەکەی مامۆستا «عەبدوڵکەرەیمی مودەڕریس»، بۆ من سەرنج ڕاکێش بوو. کۆڕەکەمان کە دوایی هات، دەستمکردە موتاڵەی دیوانەکەی «نالی». کاتێ چاوم کەوتە وشەی

‹نەی‌سەوار›، کە فەرموو بووی ‹مەعناکەیمان بۆ راست نەکرایەوە و دوور نیە ‹نێزەدار› بوو بێ و بە هەڵەی نووسیار گۆڕابێ›! کەوتە بیرم کە لە پێشەکی دیوانەکەدا، کە خودا لێ خۆش بوو، شاعیری بە ناو بانگی مەهابادی ‹هێمن› نووسی بووی، ئەویش بە هەڵە ‹نەی‌سەواری›، ‹نەیسیار› مەعنا کردبوو. ئەو شەرح و مەعنا کردنە هانی‌دام کە بۆ راست کردنەوەی هەڵەکان، تێ‌کۆشم. کە بە دوای خەریک بوونی ئەو کارە، دیتم دیوانەکە هەڵەی زۆری تێدایەو بوو بە هۆی سەرسووڕمانم، کە ئەو هەموو نووسەر و شاعیری زاناو پسپۆڕەی کوردە بۆ ئەو کارەیان نەکردووە؟!

ئەوەبوو کە دەستم کردە ساغ‌کردنەوەی دیوانەکە. با ئەوەش بڵێم تا ئەو جێگایە لە توانمدا بووە نووسیومە و درێخیشم نەکردووە. ئەوەش لە بیرنەکەم کە ئەو دیوانە کە لە بەردەستی مندایە چاپی ئینتشاراتی ‹ئەییووبی›یە. شایانی باسە، ئەمن هێندێ لەمەوپێش، سەدوپەنجا لاپەڕەم ساغ کردەوە و ناردم بۆ ورمێ. کە بەداخەوە بایەخی پێ‌نەدرا. بەڵام من، ناهومێ نەبووم و باش‌تر قوڵم لێ‌هەڵماڵی و ساغ‌کردنەوەکەم درێژە پێدا. خەریکی ئەو کارە بووم کە سەفەرێکم کەوتە پێش بۆ لەندەن. چوارمانگ لەوێ بووم. کە گەڕامەوە ئێران، بە داخەوە دیتم، دەفتەرەکەیان بەستووە و کردوویانە موئەسیسە!

ئەو چەند مانگ سەفەرە و بەستنی دەفتەری ناوەندی، کارەکەی خستمە تاخچەی فەرامۆشیەوە.

رۆژێک دەگەڵ مامۆستا ‹موحەممەدپووری داشبەندی› دانیشت

بووین. باسی «نالی» هاتە پێش. ئەمن جەرەیانەکەم بۆ گێڕاوە. فەرمووی کە حەیفە ئەو کارە بخرێتە پشت‌گوێ. هانی دام کە بە ئەو کارە درێژە بدەم. دیسان لە ساڵی حەوتاوحەوتی کۆچی، دووبارە دەستم کردە ساغ‌کردنەوەی هەڵەکان.

پێش ئەوەی هێندێک لە هەڵەکانی نووسیارەکان راست کەمەوە، پێویستە لە کانگای دڵەوە زۆر زۆر سوپاسی ماموٚستا «مەلاعەبدوٚلکەریمی مودەرریس» و کوڕەکانی بکەم.

بڕوام ئەوەیە کە ئەو سوپاس و ڕێزە، نەتەنها بە ئەستوٚی منە، بەڵکوو ئەرکی سەرشانی هەموو کوردێکی ئەدیب و ئەدەب‌دوٚستە و لە خودام داوایە دایمە لەش‌ساغ و سڵامەت و بەختەوەر بن.

هەرکەس کە ئەو دیوانە، بە تایبەت لێکوٚڵینەوەکەی موتاڵە بکات پێویستە ئەو چەند خاڵەی خوارەوە لە بەر چاو بگرێت:

١ – ئەو دیوانە لە ئەسڵدا، بە شێوەخەتی کوٚنی کوردی و وەکوو شێوەخەتی فارسی ئێستاکە نووسراوە. کە «گوڵ و گول و گڵ و گل و گەڵ وگەل»یان، «گل» نووسیوە!

٢ – ئەو کەسانەی وا دیوانەکەیان نووسیوە، چونکوو مانای هێندێ لە وشەکانیان نەزانیوە، بە خەیاڵی خوٚیان، راستیان کردووتەوە و پیتێکیان لە سەر داناوە، یان نوٚختەیەکیان لابردوە. وەکوو «شەپیووی شاپوور» و «نەخچیز». کە نەیانزانیوە مانای «شەپیووی» و «نەخچیز» چیە. هاتوون «ر»یەکیان بوٚ «شەپیووی» داناوە و کردوویانە بە «شەپیووری شاپوور»!

«کە دیتم شەکڵی صەدرەنگی، گوتم : بابایی عەییارە

کە بیستم لەفظی بێدەنگی، گوتم : شەیپووری شاپوورە»

بێدەنگی و شەیپوور؟! جێگەی سەر سوورمانە! شەیپوور نابێ بێدەنگ بێ.

یان :

«رەقیبی جوفتەلی نابێتە نەخچیزت، کە خەرکورە

ئەلیفی چایرە دائیم، لە قەشقەی کەردڕ و جەودا»

مەعنای «نەخچیز»یان نەزانیوە. نوختەی «ز»یەکەیان لابردووە و کردوویانە «نەخچیر»! کاتێ رەقیب نەبێتە شکاری کەسێک، واتای ئەوەیە کە رەقیبەکە لە ئەو کەسە، بانتر و زۆردارترە. لە کاتێکا «نالی»، رەقیبی بە هوڵیکەر شوبهاندوە و بە بێنرخ و قەشقەی داناوە، دەڵێ نابێتە «نەخچیزت»، واتە ئامبازت نابێ.

٣- ئەو نوسخانە کە گەیشتوتە دەستی مامۆستا و کورەکانی، هەندێکیان پەڕپووت و دڕاو و هەندێکیان جوان نەنووسراون و هەندێکیان پاک بوونەتەوە. (بە گوتەی لێکۆڵێنەر).

٤- بوزۆرگمێهر گوتەنی: «همه چیز را همگان دانند». هەمووان هەموو شتێک دەزانن. کە وابوو، ئیمکانی ئەوەی هەیە ئەمنیش هەندێکیانم نەزانی بێت!

ئێستا ئەو لێکۆڵێنەرە، دەبێ چەندە بە فیکر و عیلم و زانست بێ، هەتاکوو بتوانێ ئەو وشە دەسکاری کراوانە، یان خراپ نووسراوانە، جێبەجێ بکات و لە جێگەی خۆی داینێ و بزانێ ئەو وشەیە مولە یان مل،

گوڵە یان گڵ و هتد...

ئەوانە هەمووی ئەوە دەگەینێ، کە کارەکە زۆرگرینگ و سەنگینە. ئەمنیش کە هەندێ پەیجوویم کردووە و چەند هەڵەیەکم ساغکردووتەوە، چی لە توانامدا بووە کردوومە. بەڵام ئەو ساغکردنەوەی چەند شێعر و چەند شەرحە، نابێتە هۆی ئەوەکە ئیتر دیوانەکە، هەڵەی تێدا نەماوە.

چەند چەکامەم لێکنەداوەتەوە. یەکێکی مەستوورەیە. هەرچەند شێعرەکان، ئێجگار بەرزو قووڵن. بەڵام نەمزانی لەئەو قەسیدەیە کە وتراوە، «نالی» و «مەستوورە»، ئاشنایی ئەدەبیان پێکەوە بووە؟ کوڕ و کچ بوون، یان هاوسەریان بووە و مەبەست لە ئەو شێعرە چی بووە؟!

یان چەکامەی «قوربانی تۆزی رێگەتم..». چونکوو بە جێگەکان و شەقام و کوڵانەکان و جۆ و جۆبار و کێو و دەشتی سولەیمانی، ناشارەزام، کارم پێوە نەبووە.

لە خوێنەران و زانایان تکا دەکەم، ئەگەر کەموکوڕی لە ئەو ساغکردنەوەیە بەر چاویان کەوت، منەتم لە سەرنن و ئاگادارم فەرموون.

**علی محمد رضاوندی. (باپیر).**

**تێبینی:** هەر شێعرێ کە لێکی‌دەدەمەوە، ژمارەی لاپەڕەی دیوانەکەی چاپی ناوەندی بڵاوکردنەوەی ئەدەبیاتی کوردی، ئینتشاراتی «سەلاحەددینی ئەییووبی»یە. کە شێعرەکەی تێدایە و لە نێوان دوو کەواندا (....) نووسیومە.

**(٧۶) فەییاضی ریاضی گوڵ و مێهر و مل و لەعلی**

**ئەی شەوقی روخ و ذەوقی لەبت، ذائیقە بەخشا**

**فەیاض :** باران‌ڕێژ، بەرەکەت بەخش.

**ریاض :** جەمعی رەوزەیە، واتا باخچە.

**مێهر :** رۆحم، خۆر، نێوی گیایەکە، مانگی حەوتەم، رۆژی ۱۶/ی هەموو مانگێ.

**موڵ :** شەراب هەرمێ.

**مل :** ئەستۆ، گەردن، کوڵوو.

**شەوق :** تاسە، ئارەزوو، هیوا، ویستن، دڵخۆشی و شادی، خواهێشت، بێ‌قەراری.

**رۆخ :** روو، دەم و چاو.

**ذەوق :** تام کردن، چەشین، تام و مەزە، خۆشی.

**ذائیقە :** هێزی تام کردن، چەشتن.

**لەعل :** بەردی بەقیمەت، کینایەیە لە لێو، گوڵومـوڵو مێهرولـەعل، پێکـەوە بـە کینایە، بە مەعنای بەهارە.

* واتە : ئەی ئەو کەسەی کە خێر و بەرەکەت ئەرژێنیتە سەر گیاوگوڵی سوورەوە. یان گوڵنا و لێوی یارەکەم و بەهار، بە بۆنەی بارانڕێژی تۆوە خۆش‌ڕەنگە و گوڵ و موڵ، شادی تێدایە. هەروەها، ئەی ئەو کەسەی کە ئارەزووی چەشتنی لێوی وەك لەعل، ئەخەیتە دڵ و دەروونەوە. چون خیتابی «لەبت»ی تێدایە ئەتوانین رووی دەم لە یار بکەین و بڵێین ئەتۆ رازێنەری بەهاری و ورشەی روومەت و تامی دەمت هۆی خۆشی و شادیە.

* * *

**(٧٦) ذەرراتی عوکووسی، کەششی مێهر و جەلالن**
**وا دێن و دەچن، سەرزەدە، سوڵطان و شەهەنشا**

**ذەررە :** وردەی هەموو شتێك، مێلوورەی زۆر بچووك، تۆز، لە میقیاسدا یەك لە سەدی جۆ، بچووکترین و وردترین شتێك لە هەر شتدا.

**عوکووس :** شەوق، ورشە، رووناکی.

**مێهر :** خۆر، رۆحم.

**کەشیش :** جازیبە، بەرەو خۆکێشان.

**جەلال :** گەورەیی، پاکی، پاك بوون، پایەبەرزی، شان و شەوکەت.

**سەرزەدە :** بێخەبەر و بێئاگادار کردن، (بێئەوەی کە پێمان خەبەر بدات، سەرزەدە هاتەماڵەوە).

* واتە : ئەو هەموو پادشا و سوڵتان و شایشاکان،کە هەر لە خۆیانەوە دێن و دەبنە شاو، هەروا بێخەبەر دەچن، (لە شاهی دەکەون و دواجاریش تێدا دەچن و دەرۆن)، هەمووی ئەوانە بچووکترین و وردترین شتێکە کە گیانداران رائەکێشێنە لای خوداپەرستی و ئیمانەوە.

* * *

**(٨٠) رەنگی نیە روخسارەیی رەنگین و لەطیفی**
**رۆشن بووە ئەم نوکتە، ثوباتی لەبەصەردا**

**رەنگ :** لە فارسیدا مەعنای زۆری هەیە. وەکوو فایدە و نەفع، ماڵ و دارایی، زۆر، تەرز و شێوە، چەشن، فەن و فێڵ، مەکر، ناسکی و جوانی، خۆشی و خۆشحاڵی، خوێن، رەونەق،(اخذ و جر)، تەما و ویست، خواهان، سەرمایەی کەم، تەڵا و نوقرەی دزی، قومار و شتێك بە قومار ببردرێتەوە، تەرح و نەقشە، خەیانەت.

**ثوبات :** ئەو دەرد و ئازارە کە چاو موڵەق دەکات، چاو ماق دەمێنێ و ناتوانێ بتروکێ.

* واتە : ڕوومەتی جوانی ناسکی ڕەنگینی (گەردەنی زەرد، لێو و گۆنای سوور و قژی کاڵ و برۆی ڕەش)، چەشن و وێنەی نیە. چونکوو بە موڵەق بوونی چاوم، کە بە دیتنی ئەو ڕوخسارە جوانە هەروا داچەقیوە و ناتوانم چاو بترووکێنم، وازیح و ڕۆشن بووە و ئیتر دەلیل و بەڵگەی ناوێ.

هەروا کە لە پێشەکیدا هێناومە، دیوانی «نالی» لە ئەسڵدا بە خەتی کۆنی کوردی وەکوو فارسی ئێستا، نووسراوە. (ثبات) ئەتوانێ بە «سەبات» یان «سوبات»، یان «سیبات» بخوێنرێت کە لێکۆڵینەر دەبێ لە ڕێگای مەعناوە بزانێ کە «سوباتە» یان «سەبات» و هتد...

* * *

**(٨۴) دەمدەم کە دەکا زاری پڕئازاری بە غونچە**
**بۆ دەعوەتی ماچی لەبە گۆیا، دەمی نادا**

**دەمدەم :** جارجار.
**گۆیا :** لێرە مەعنای «بەڵام»ە.
**دەمی نادا :** نالوێ، فرسەتی ئەو کارە نیە.

* واتە : جارجار کە زارە جوانەکەی کە بۆ عاشقان پڕئازارە و لەبەر هێشتا نەشکۆفیاوی وەکوو خونچە قوت ئەکاتەوە، بۆ ئەوەیە کە وەرن ماچم بکەن. بەڵام کوانێ ئەو بەخت و ئیقباڵە؟ چونکوو فرسەت نیە و نالوێ بڕۆم بۆ ماچ کردن. جا چ داخێ لەوە بانتر؟!

* * *

**(٨٧) ڕەقیبی جوفتەلی نابێتە نەخچیزت کە خەرکوڕە**
**ئەلیفی چایرە دائیم، لە قەشقەی کەردڕ و جەودا**

**ڕەقیب :** بەدکار.
**جوفتەلی :** جوفتە هاوێژ.

**نەخچیز :** پاپەی بوون، بەرهەڵست بوون، ئامباز بوون، پێدا پێچان.
**ئەلیف :** هۆگر.
**چایر :** (تورکیە) هڵیز، هریز.
**قەشقە :** ناو چاوگرژ و بەدئۆغر، ناهومێ لە بەش‌و نسیو، تووش و بەدیومن.
ئەوانەی کە دیوانەکەیان نووسیوە، واتای «نەخچیز»یـان نـەزانیوە. نوقتەکـەیان لابردووە، بێ‌ئەوەی کە تێفکرن کاتێك رەقیب بە نەخچیری(شکار) کەسێك نـەبێ، واتای ئەوەیە کە رەقیب بان‌تر و سەرترە و بەهیمەت‌ترە. کەوابوو نـاتوانێ ببێتـە هۆگری چایر و بێ‌بایەخ بێت!
«نالی» بەخۆی دەڵێ :
* کارت بە رەقیبەوە نەبێ. ئەو زۆر بێ‌بایەخە و ناتوانێ بپێچێتە قولتـا و بەرهەڵستی تۆ بێ. کەسێکە هەر وەکوو هوڵی‌کەرێ کە دایمە بیر لـە درك و داڵ و هڵیز و جۆ دەکات و بەش و نسیوی چارەڕەشی و بێ‌بایەخی‌یە. کـەی ئـەتوانێ پاپەی تۆ بێت و ئامبازی تۆ بێت؟ نایارەکەی تۆ زۆر بەرز و بەنرخە. هاوشـانی ئەوە نیە. کارت پێ‌یەوە نەبێ. ئەو خەریکی شتهایەکی بێ‌بایەخە.

* * *

**(٨٨) سیلاحی پەرچەمی پڕخەم، ئەگەر تارە و ئەگەر مارە**
**برۆ و غەمزەی کەوان و تیر، ئەگەر هەودا و ئەگەر مەودا**
**ئەو بەیتە بە تەنهایی مەعنا نـاکرێت، چونکـوو وابەسـتە بـە بـەیتی پاشەوەیە. هەردوو بەیتەکە پێکەوە مەعنا دەکەین.**
**(٨٨) لە ئەشکەنجەی شکەنجی زوڵفی ئەو، بێ‌وەعدە مورغی دڵ**
**دەناڵێنێ وەکوو بولبول لە صوبحی کاذیبی شەودا**
**ئەگەر تارە :** وەکوو شەوی بە قیمەتە.
**ئەگەر مارە :** وەکوو ماری سەری گەنج، کە روومەتە جوانەکەیە.
**هەودا :** ئاورێشم.
**برۆ :** زێهی کەوان.

**مەودا :** نشتەر.
**ئەشکەنجە :** ئازار.
**شکەنج :** پێچ و لوول.
**مورغی دڵ :** کینایەیە لە دڵ ویستن.
**صوبحی کاذیب :** ئاخری شەو کە هێشتا ڕۆژ نەبووەتەوە بەڵام ئاسمان نەختێ ڕۆشن دەبێ. کە پەلەوەری بەربەیان «شباهنگ»، دەس دەکا بە خوێندن.

* واتە : چەکی زوڵفی پڕئازاری یار ئەگەر لەبەر ڕەشی بێ و ئەگەر وەکوو ئەژدیها، لە سەر گەنجی ڕوومەتی جوانی یار نووستبێت، هەروەها ئەگەر برۆی یار وەکوو زێهی کەوان بێت و ئەگەر برژانگی نشتەر بێ، بایسی ئازاری دڵی منە. ئەوەتە کە دڵی من کە ئەوەیە دەوێ، وەکوو پەلەوەری بەربەیان لە کاتێکدا کە زوڵفە ڕەشەکەی لە سەر ڕوومەتی لائەچێ و فەرحانەتێ ئەخاتە دڵمەوە. کاتێ کە دایئەپۆشێ دڵی من وەکوو ئەو شەباهەنگە دەس‌دەکا بە ناڵین بۆ دیتنی ڕوومەتە جوانەکەی.

* * *

**(٩٠) شەبەهی زوڵفی شەبەهـگۆنەیە ڕووگەردانی**
**بە سەری ئەو، کە بە سەودا، سەر و سامانم دا**

**شەبەهی (یەکەم) :** ڕەشی.
**شەبەهی (دووهەم) :** مووررووی شەوەی بەقیمەت، (شبق).
**گۆنە :** وەکوو.
**ڕووگەردانی :** ڕوو وەرچەرخاندنێك، ئەوەندەی بەربکەی بە ئەو لاوە، لەحزەیەك.
**سەودا :** ڕەشایی، عەشق، مامەڵە.

* واتە : زوڵفە ڕەشە جوانەکەی لە چەشنی بەردی ڕەشی بەقیمەتی شەوەیە. دەری خست و بووە هۆی ئەوەی ئاگر لە جەرگم بڵێسە بسێنێ و بە

خاتری عەشقی ئەو، سەروماڵ و گیان و دارونەدارم فیدای کرد و لە دەس دا.

* * *

**(٩٥) «نالی» مـەثـەلی حالی، لە ئەشکەنجەییی غەمدا**
**وەک ناڵە لە نەیدا، وەکو نالە لە قەڵەمدا**

**مـەثـەل :** نموونە.
**ئەشکەنجە :** ئازار.
**ناڵە :** هاوار.
**نەی :** شمشاڵ.
**نال :** تاڵەباریکەکانی نێو قەڵەمی قامیش.

* واتە : دەزانی حاڵی «نالی» بە دەست دەرد و ئازاری بێ‌مێهری یارەوە چۆنە؟ ناڵە و هاواری دڵی غەمگینی، وەکوو دەنگی شمشاڵەکەیە کە زۆر خـەمین وخەمبارە و لە دووری و هێجرانی‌دا لـەرِولاواز بووەتـەوە. ئـەوەندە بێ‌گیـان و باریکە هەروەکوو تاڵەباریکەکەی نێو قەڵەمی قامیش وایە.

* * *

**(١١١) طالیبی لێوین و ئەڵقەی زوڵفمان نیشان دەدا**
**رارەوی میصرین و ئەو روومان لە موڵکی چین دەکا**

**میصر :** پەردەی نێوان دوو شت، تیژی، گوڵی سوور، شار«مصر/القـاهرە»، کـە جەمعەکەی «امصار»ە، لێرە مەبەسـتی «نـالی» لـە «میصـر»، گوڵـی سـوورە و کینایەیە لە لێوە سوورەکەی یار.

**موڵکی چین :** کینایەیە لە زوڵفە رەشە چین‌چینەکەی یار.

* واتە : ئێمە خواهانی لێوی سوورین و داوای ماچی لێ‌دەکـەین. ئـەو زوڵفی نیشان دەدا! دەمانەوێ بۆ ماچ‌کردنی لێوی وەک‌گوڵی‌سووری برۆین. ئـەو زوڵفە پرِچینەکەی ئەخاتە سەر لێوی و دای‌دەپۆشی.

* * *

تیشکی ددانەکانتیش کە لە تیشکی برووسکە جوان‌ترە، ڕاکێش و جازیبە و، خەڵکی دەکێشێتە لای تۆوە.

* * *

**(١١٨) حیرەت‌زەدە، وا دیدە، وەکوو حەڵقەیی دەرما**
**بێ‌مایە نییە عاشیقی بێچارە، (بفرما)!**

**وا :** باز، ئاوەڵا (وشەکە فارسیە).
**وا دیدە :** چاو ئاوەڵا، چاو داچەقیو.

* واتە : هەرکە تۆم چاو پێکەوت، بە سەرسوورمانەوە چاوم داچەقی و هەر وەکوو حەڵقەی دەرگا، لە بەر جوانی و نازاریت، ئاوەڵا مایەوە. ئێستا کە هاتووی، عاشقی بێچارەت بێ‌بایەخ مەزانە و پێت وانەبێ کە هیچێکی نیە. عیلم و مەعریفەتی هەیە. فەرموو، فەرمووە ژوورەوە.

* * *

**(١٢١) یا توربەتێ یا غوربەتێ با ڕێ بشکێنین**
**هەر مونتەظیرە «نالی»، ئەگەر مرد و ئەگەر ما**

**ڕێ شکاندن :** دوو مانای هەیە :
١ – ڕێگە چوون، ڕچە شکاندن.
٢ – لە ڕێگە لادان.

«ئەی برا ئەوە چەند جار لێرەوە ڕۆیشتون بۆ شار. جارێکیان ڕێگەتان بشکاندایا و سەرێکتان لێمان بدایا». مەبەستی «نالی» لێرە، لادانە.

* واتە : «نالی» ئەڵێ من چاوەڕێ یارم، بە زیندووی یان مردوویی. ئینجا لە زوانی یارەوە دەڵێ با سەرێك لە «نالی» بدەین. چونکوو چاوەڕێمانە چ مردوو بێ، چ زیندوو!

* * *

**(۱۱۲) تا موعەییەن بێ کە زۆرن دەس گرییو دەس کوژی**
**فەرقی سەر پەنجەی بە خوێناوی حەنا رەنگین دەکا**

**فەرق :** بان سەر.
**سەرپەنجە :** نینوك.
**فەرقی سەرپەنجە :** بانی نینوك.

*واتە : بۆ ئەوەی هەمووان ئاگادار بکات کە کەسی زۆری بە دیل گرتووە و گیرۆدەی خۆی کردووە و لە داخاندا کوشتوویە، هاتووە سەرپەنجەی بە خوێناوی وەکوو خەنە رەنگ کردووە.

* * *

**(۱۱۲) بێقسە غونچەی دەمت کاتی تەبەسسوم رووبەڕوو**
**هەتکی شوعلەی بەرق و نەظمی دائیرەی پەروین دەکا**

**بێقسە :** بێقسە و باس، بێگفتوگۆ.
**پەروین :** یان دائیرەی پەروین، ئەو چەند ئەستێرە وردەیە کە پێکەوەن و دەڵێن هۆی یەکیەتی و خڕ بوونەوەیە، دژی «بنات‌النعش».کە هۆی جیاوازی و پەرێشانی و بڵاوبوونەوەیە :

**جمع برآمد همی شکوفه چو پروین**
**باز شود چون بنات نعش پریشان**

شێعر هی موختاریە. واتە : شکۆفەکان خڕ دەبنەوە وەکوو پەروین و دووبارە وەکوو بەناتۆلنەعش بڵاو دەبنەوە.

*واتە : بێگفتوگۆ خونچەی دەمەکەت کاتی خرکردنەوەی، ئەوەندە جوانە، کە ئابڕووی ئەستێرەی پەروین دەبات، کە هۆی پێك گەیشتن و خڕ بوونەوەیە. هەروەها کاتی زەردەخەنەش کە ددانە وەك مرواری‌یەکانت دەردەکەوێ، ئابڕووی ڕۆشنایی و تیشکی برووسکەی هەوری دەبات. چونکوو غونچەی دەمە جوانەکەت لە ڕێك و پێکی دا لە دائیرەی پەروین جوانترە و

**(١٢٢) حەڵاڵی بیٚنیکاحی حووری عینم**
**بە جووتیٚ ناظیری شەرع و فەتاوا**

**حەڵال بوون :** ڕەوا بوون، موبارەك بوون.

**حووری عین :** کینایەیە لە «حەبیبە».

**جووتیٚ ناظیر :** هەردوو چاوەکانی «حەبیبە».

* واتە : حەبیبە، خۆشەویستەکەی من، کە مارەم کردووە، حۆریعەینە. ئەو مارە کردنە، لیٚموبارەك بیٚ. هەرچەند بە پیٚ شەرع و فەتوا، ئەبیٚ کاتی مارەبڕین دوو شایەت بین. ئەو شایەتانە ناویٚ. چاوە جوانەکانی حەبیبە لە جیاتی شایەت، قوبووڵە.

* * *

**(١٢٣) زەفافەتگاهی پەردەی ئاڵی چاوم**
**موبارەک حەجلە بیٚ بۆ بووک و زاوا**

**زەفاف :** ناردنی بووك بۆ ماڵی زاوا.

**زەفافەتگاه :** جیٚگەی گواستنەوەی بووك لە ماڵی زاوا، جیٚگەی پیٚك گەیشتنی بووك و زاوا.

**پەردە :** حەجلە.

* واتە : ئازیزەکەم! قەدەم بنە سەرچاوم. ئەو چاوە کە بە بۆنەی دووری تۆوە ئەوەندە فرمیٚسکی لیٚ هاتووەخوار،کە سوور بووەتەوە . ئەو پەردەی چاومە، باشترین و ڕەواترین پەردە و حەجلەیە بۆ هەردووکمان.

* * *

**(١٢٣) صیداقی و ڕوونوماوو وەصڵی شاهید**
**لەگەڵ شاییکەران بیٚجەنگ و داوا**

**صیداق :** مارەیی، شیروایی.

**ڕوونوما :** ئەو پارە یان زیٚڕە کە دەیدەن بە بووك کاتی تارا لابردن، شەرمەشکیٚنیٚ.

**وەصلْ :** کینایەیە لە «صیلە» واتە ئەنعام و بەرات.
**شاهید :** تەماشاگەر.

* واتە : ئازیزەکەم! مارەیی و شیروایی و شەرمەشکێنی و ئەنعام و بەراتی شایەتەکان و تەماشاکەرانمان بۆ چیە؟ بێهەرا و هوریا و جەنگ و داوا پێگەیشتوین. وا دیارە مەلا« خدر»، خۆی سیغەی عەقدی خوێندوە!

* * *

**(١٢٤) پەچەیی پەرچەمیو و پرچی سیا**
**هەر دەڵێی مانگەشەوە کوڵمی تیا**

**پەچە :** رووبەندی ژنان، پیژانی نان، جێگەی پەچەخواردنی ران لە دەشت و دەران بە دەور یەکدا، کە حەڵقە دەبەستن پێدەڵێن پەچەیان خواردووە، کوڵمە زۆر جوانەکەی یار کە زۆر ورشەدار و بریقەدارە، لە نێو زوڵفە رەشەکەی دا ئەوەندە جوان و بەنرخە دەڵێی مانگەشەوە لە تاریکیدا.

* * *

**(١٣٠) سەرگرانە قافڵەسالاری رێی چین و خەتا**
**چونکە باری عەنبەر و میسکە، لە زوڵفەینی دو تا**

**سەرگران :**
١ - قەڵس، توورە.

**خاقانیا ز دل سبکی سرگران مباش**
**گوهر کە زادەی سخن توست، خصم توست**

واتە : خاقانی لە نەفامی و تێنەگەیشتووی خەڵك توورە مەبە. چونکوو شێعرەکانت کە وەکووگەوهەرە، بووەتە دوژمنت.
٢ - بە فیز و دەمار و خۆ بەزل زان.

**«کسی را بدە پایەی مهتری  کە با کهتران سر ندارد گران»**

واتە : خودایا! پایەبەرزی و گەورەیی بە کەسێ ببەخشە، کە دەگەڵ ژێردەستەکانا، بەفیز و دەمار و موتەکەببیر نەبێ.

٣ - بێئیعتینایی و بێپەروایی و بایەخ بەکەس نەدان.
**«کمال بخت خردمند نیکمرد آن است**

**که سر گران نکند، بر قلندر و درویش»**

واتە : باشترین خۆشبەختی پیاوی زانای چاك ئەوەیە کە لەبەرانبەر هەژار و فەقیردا بێپەروا و بێئیعتینا نەبێت.

**قافڵەسالاری ڕێ چین و خەتا :** کینایەیە لە ژنی نازدار و جوان و شۆخ و شەنگ. چونکوو دەڵێن چین و خەتا جێگەی نازدارانە. زوڵفە چنراوەکەشی کە بووتەوە پەلکە و بە ئەم لاو ئەولای شانەکانیا شۆڕ بووەتەوە، شوبهاندویە بە باری مێسك و عەنبەر چونکوو هەم بۆنی خۆشە، هەم مێسکی خەتا بەناوباگە.

**قافڵە سالار :** گەورەی کارەوان.

* واتە : یارەکەم بەنرختر و شۆخ و شەنگ‌ترینە و زوڵفەکانی ئەوەندە بۆن خۆشە، دەڵێی مێسك و عەنبەرە. بەڵام لەبەر جوانی و نازداری زۆر بێپەروا و بە فیز و دەمارە و ڕەحم لێناکات!

* * *

**(١٤٢) ئەو فەوت و وەفاتە سەبەبی عەهد و وەفاتە**

**چوو صائیقەیی بەردی عەجووز و گوڵ و مول، هات**

هەروا کە لە پێشەکیدا گوتم، ئەو دیوانە بەخەتی کۆنی کوردی نووسراوە و (مل و مەل و مۆل) تەنها «مل» نووسراوە و مەعنای شێعرەکە دەبێتە هۆی جیاکردنەوەی وشەکە. بە پێی مەعنا (مۆل)ە نە (مل).

بە دوای شەشەڵان(١٨ ڕۆژەی ڕەشەمە)، بە پێی حیسابانی کۆن، بەردی عەجووزە، ئاخرین و دوایین ڕۆژەکانی زستانە و گوڵ و مۆل کینایەیە لە بەهار.

**«هنگام گل و مل است و یاران سرمست**

**خوش‌باش دمی که زندگانی این است»**

واتە : وەرز و کاتی بەهارە و یاران سەرمەستن، تۆزێ خۆش بژی کە ژیان، یانی ئەوە.

«نالی» رووی دەمی لە «حەبیبەیە» و دەڵێ:

* هەروا کە زستان رۆیشت و سەرما و سەخڵەت و لە ماڵ دەرنەکەوتن نەما و بەهار هاتەوە. نۆرەی خۆشی و گەشت و گێل و خۆش رابواردنە. ئێستا کە بابت مردووە ئیتر کەسێك نەماوە تاکوو بەرگریت بکات، ئەتۆش بەڵێنت دابوو کە پێکەوە بین. دەی وەرە با پێکەوە خۆش بین.

* * *

**(١٤٥) شایستەیی شان، لایقی مل، طوررەیی تۆیە**

**نەک طوررەیی شاهەنشەهی‌یو طەوقی وەزارەت**

**طوررە**: قژی لوول، پەلکە، ئەگریجە، ریشکە و ریشووڵەی مێزەر، کنارە و حاشیەی جل و ...

**طەوق** : ملوانکە، حەڵقەی دەوری ملی کۆترەباریکە (قومری).

* واتە : تەنها پەلکەکانی تۆیە کە شایان و لایەقی گەردەن و شان و ملە جوانەکەی تۆیە. نەك ئەو ریشکە و ریشووڵەی هاورێشمی گرانبەهای شاکان و ملوێنکەکانی وەزیرەکان.

* * *

**(١٤٦) کێ دەستی دەگاتە بەی و ناری نەگەیشتووت**

**لەو تەختە کە وا صاحیبی مۆرن، بە صەدارەت**

هەروا کە لە تەواوی پارچە شێعرەکەدا، دیارە و دەردەکەوێ، ئەو کچە کە «نالی» خیتابی بە ئەوە، زۆر لە «نالی» بەرزترە و «نالی» خۆی بە هاوشانی ئەو دانانێ! ئەوەتە لە شێعرەکەدا دەڵێ :

* ئەتۆ خاوەنی تەخت و سەدارەت و باڵانشینیت و مووررووی فەرمانرەوایی و باڵانشینیت پێیە. ئینجا کێ ئەتوانێ دەست بۆ تۆ بەرێ و دەست بیات بۆ ئەو مەمکانە وەکوو هەنار و بەهێ نەگەیشتووە کە ها بەسەر سنگتەوە؟ نا، نا، کەس ناتوانێ!

* * *

**(١٥٢) ئەی سەروی بوڵەند قەدد و، بڕۆ تاق و مەمک جووت!**
**کێ دەستی دەگاتە بەی و ناری نەگەیشتووت؟!**

**بڕۆ تاق :** بڕۆی پەیوەست.

**ناری نەگەیشتوو :** مەبەست مەمکی تازە پێگەیشتووی یارە.

* واتە : ئەی یاری باڵابەرز و بەشان و شەوکەت،کە بڕۆت پەیوەستە و مەمکەکانت هەر وەکوو هەنار و بەهێ تازە پێگەیشتووە، ماشەڵا ئەوەندە بەرزەفەڕ و بە شان و شەوکەتی کەس ناوێرێ دەست ببات بۆ مەمکەکانت.

* * *

**(١٥٢) دەم هەمدەمی غونچێکە نەپشکووتووە هێشتا**
**با، کەشفی نەکرد بەرگی عەطرپۆشی گوڵی رووت**

**دەم :** زار، نەفەس و هەناسە، خوێن.

هەمدەم : هاودەم.

* واتە : زارە جوانەکەی یار، هەر وەکوو خونچەی نەشکۆفیاوە و زۆر جوانە. «با» نەیتوانیوە بەرگی رووپۆشی کە بەسەر روخسارە جوانەکەیەتی لابەرێ و روومەتی بێهاوتای دەربخات. بە واتای ئەوەیە کە کەس روومەتە جوانەکەی یاری نەدیووە.

* * *

**(١٦٤) ساقی وەرە رەنگین کە بە پەنجە لەبی ئەقەداح**
**بەم راحە، لە سەر راحە، دەڵێن : راحەتی ئەرواح**

**ساقی :** مەیگێڕ.

**رەنگین کە :** بڕازێنەرەوە، رەونەقی پێ بدە.

**ئەقداح :** جەمعی قەدەحە.

**راح :** پیاڵەی شەراب، پێکی شەراب، شادومانی.

**پەنجە :** لەپی دەست، نێوی ئاهەنگێکە لە مۆسیقادا.
**راحەتی ئەرواح :** ئارامی گیان.
* واتە : مەیگێر وەرە بە پەنجە جوانەکانتەوە پیاڵەی شەرابەکەمان برازێنەرەوە و بە ئەو پیاڵە شەرابە، یان بە ئەو شەرابە کە وا لە سەر پەنجەکەتدا و ئارامی گیانە، رۆح و گیانمان بحەسێنەوە.

* * *

**(١٦٧) لەم گەردشی مینایە، کە وا دەورە، نە جەورە**
**ساقی کەرەمی سایغە، «نالی» مەکە ئیلحاح**

**گەردش :** گەراندن.
**مینا :** پەلەوەرێکە وەکوو رەشوولە، لەنگەرگای کەشتی لە قەراخ دەریا، کینایەیە لە ئاسمانی شین، ئاوێنەی رەنگاورەنگ، پیاڵە، جام، شیشەی شەراب، شەراو، گەوهەری شین، مووررووی کەوو، (سولفاتی مسی بریقەدار کە رەنگی شینی زۆر جوانی هەیە. فیرموولی شیمیایەکەی ئاوایە cuso4 ).
**دەور :** نۆبەتی، بەنۆرە.
**جەور :** ستەم.
**ساقی :** مەیگێر.
**سایغ :** خۆش، رەوا، گەوارا، بەتام و مەزە، شتێك کە هاسان بە قورگا بچێتە خوارەوە، بە جوانی شەراب بە دەم کەسێکەوە کردن.
**سایق :** رانندە و لێخور، لێرەدا مەعنا نابەخشێ و هەڵەیە بەڵکوو وشەی سایغ دروستە.
* واتە : ئەو گەراندنی پیاڵەی شەرابە کە بە نۆرەیە و مەیگێر بێزوڵم و زۆر ئەیگەرێنێ، مەبەستی خۆشی ئێمەیە و نەوبەتیە. جا پارانەوەی بۆ چی‌یە؟!

* * *

**(٢٠٢) نووری چاوم! چاوەکەم بێنوورە بێتۆ، ذەررەیی**
**خاکی دەرگاکەت ببێژم، بیکەمە کوحلی بەصەر**

* واتە : بینایی چاوم! ئازیزەکەم! هەرکاتێ چاوم پێت نەکەوێ و نەتبینم، چاوم رۆشنایی نامێنێ و بێنووره. دەبێ چبکەم؟ ئێستا کە ناتبینم و بەرچاوم تاریك دەبێ، ناچارم خاکی بەردەرگاکەت کە تۆی ئازیز بە سەریا هات و چووت کردووە، ببێژم و بیکەمە کلە بۆ چاوەکانم. بەڵکوو بە ئەو بۆنەوە نەختێ رۆشنایی بکەوێتە بەر چاوم.

* * *

**(٢٠٤) شەوی بەهاری جوانی، خەوێ بوو پڕ تەشویر**
**لە فەجری پایزی پیری بەیانی دا تەعبیر**

**تەشویر :** غارنانی ئەسپ بۆ فرۆشتن، شەرمەزارکردن، شەرمەزار بوون، پەرێشانی و تێك چوون، بە دەست ئیشارە کردن بەرەو کەسێك، دەماندن و فوو لێکردنی ئاگر، شواڵ داکەندن، ئاڵۆز بوون، ئاڵۆزکردن.

**فەجری پایزی پیری :** تازە بەرەو پیری چوون، سەرەتای پیری.

**تەعبیر:** شەرح‌دان، ئاگا کردنی خەون، شەرح کردن و شەرح دانەوەی وتار، پەڕینەوە لە ئاو، سەخڵەت بوونی کار بۆ کەسێك، ئاشکرا بوون و ئاشکرا کردنی مانای حەقیقی، جوان لە جوانی‌دا بە تایبەت بەهاری جوانی خەوی خۆش و ناخۆش و جۆربەجۆر و ئاڵۆز ئەبینێ.

* واتە : ئەوە سەرەتای پیریە و هێشتا نەحەساومەتەوە و شتێکم بە دەست نەکەوتووە. نە لە عیلم و نە لە ئیمان ونە لە پارە و دارایی و ماڵی دنیا. ئەوەیەکە ئەو خەوە پڕ تەشویر و ئاڵۆزەم هاتە دی و بۆم روون بووە.

* * *

**(٢٠٦) چ شەو، چ ڕۆژ؟ وەها کورتی لەهو و لەعب و میزاح**
**کە هەردو وەک‌یەک ئەچوون بە نەغمەیی بەم و زیر**

ئەو شێعرە درێژەی شێعری پێشووە.

* واتە : ڕۆژگاری من بەگەمە و گاڵتە و کایە بگرد و لەبەر چاوم تونـد و تیژ، تێپەڕی و شەو ڕۆژم هەر لە یەك دەچوون و هیـچ جیاوازی‌یـەکیان لـە ئارادا نەبوو. شەوکاتی حەسـانەوە عیبـادەت و خـەو بێـت و ڕۆژ کـاتی کـار و کۆشش. بەداخەوە بۆ من هەر وەکوو دەنگی بەمی سیمە ئەستوورەکەی تار، یـان دەنگی ناسکی سیمە باریکەکەی بوو کە بە گاڵتە و گەپ تێپەڕی.

* * *

**(٢٠٦) ئەسەف! درێژی شەو و ڕۆژی ئەو شەو ڕۆژەم**
**قوصووریان بووە طوولی نەدامەتی تەقصیر**

**ئەسەف :** بە داخەوە.
**قوصوور :** داماوی، زەبوون بوون، کورت بوون، لە تەقسیر بگـردن، نیشـتنەوە، قەرار و ئارام گرتن، گران بوون و هەرزان بوون کە ئەزدادە، کەمەو بوون، تەنگ کردنەوە، کورتی.
**طوول :** درێژی، قودرەت، چاکە، دەوڵەمەندی، فراوانی،(لەم بارەوە دەتوانـین بـە «طەول» بیخوێنینەوە).
**تەقصیر :** سستی و کۆتایی کردن، کورت کردنـەوە، یـەك خسـتنی کـار و بـار، هێمنەوە بوونی تووڕەیی و دەرد و ئازار، بن مل داخ کردن، جل و بەرگ کوتان، سەهو و غەڵەت و ...
**نەدامەت :** پەشیمانی.

* واتە : بە داخـەوە درێـژی شەو و ڕۆژی نـاوبراوم (مەبەست دوو شێعری پێشەوەیە)، کە بە هەڵە ڕۆیشتم، بە بێبایەخی تێپەڕی. هەرچەند کـورت بوو، واتە دەوری جوانی و لاویم. بەڵام کورتیەکەیان بووە هۆی درێژی و فراوانی پەشیمانیم لە سستی و کۆتایی کردنی کردەوەی باش و خوداپەسەندانە دا.

* * *

**(٢٠٦) سەودای طوررەیی ئەو ئیشتیباهی سەهوی جوان**
**بەیاضی غوررەیی ئەم ئینتیباهی سوجدەیی پیر**

**سەودا :** رەشی، دیەنی شار لە دوورەوە، خوێندەواری.
**طوررە :** موو، زوڵف.
**ئیشتیباه :** وەك یەك بوون، وەکوو شتێك بوون، شاردراوە بوونی کار، بە غەڵـەت شتێك لە جیاتی شتێك دیکە گرتن، لەشتێك چوون :

**فلکی، مهی، ندانم، به چه کنیتت بخوانم؟**
**به کدام جنس گویم که تو اشتباه داری**
**«سعدی»**

واتە : گەردوونی، یان مانگی؟ نازانم بە کام لەقەب بتخوێنمەوە، بە کـام شت بتشوبهێنم کە لە ئەوە دەچی؟

ئینتیباه : لە خەو هەستان، وریا بوونەوە، ئاگاداربوون، بە شەرەف بوون، دیققەت.
ئەوە ئیشارەیە بە رەشی مووی جوانی و لاویەتی، ئەم بە سپیەتی مووی بە پیری.

* واتە : رەشی زوڵفی جوانیم،«ئیشتیباهی» تاریکی بـە هەڵـە چـوونی جوانیمە. سپیەتی ناو چاوانی ئێستەم دەگەڵ سـپیەتی ردینـم، دیقـەت و وریـا و ئاگابوونەوەیە، کە دان بە ئەوە دابنم کە بەهەڵە چووم و تۆبە بکەم.

* * *

**(٢٤٩) شیرینی‌یو، لە تاڵی‌یو ترشیی عیتابی رووت**
**خاڵت لەسەر جەبین، بووەتە دانەیی سماق**

لە فارسیدا مەسەلێك هەیە، کاتێ کە دەیان هەوێ کەسێك زۆر چـاوەرێ بێـت و نەگاتە ئارەزوو و ویستی خۆی، پێ‌دەڵێن: «باید سماق بمکی»! واتـە دەبێ سمـاق بمژی.

* واتە : شیرینەکەم! ئەتۆ زۆر جوانی و شیرینی. بەڵام تاڵی و ترشـی و رووگرژیت لە کاتێ تانە و تەشەر دا، پێم دەسەلمێنێ کە دەبێ دەس هەڵگرت بم و سماق بمژم. واتە ناهومێ بم! باشە بـە قسـەت دەکـەم. ئـەوە لـە روخسـارە زۆر

جوانەکەتدا خاڵێك هەیە، هەروەکوو سماقە. ئەوە دێم و ئەو خاڵە دەمژم!

* * *

**(٢٥٠) صوٚفی لە فەقر و فاقە وەکو فاقە فاقی دا**
**تەسبێحی دام و دانەیە، ریشی دو فاقی فاق**

**فاقی (ئەوەڵ)** : مەلی مل درێژی چەمیوە.
**فاقی (دووهەم)** : چاڵی بێخ تیرکەوان.

* واتە : سوٚفی لە هەژاری و بێبەشی وەکوو ئەو پەلەوەرە ملدرێژەی چەمیوە، چەمیوەتەوە. ئێستا بوٚ فریودانی خەڵك(کە خەڵات و بەراتی بوٚ بێنن)، تەزبێحەکەی کردووە ئەو دانەی داوە و ریشە دوفلیقانەکەی کردووە تیرکەوان، بوٚ پێکان و بەداو خستنی نەزانکاران.

* * *

**(٢٦٦) فەرقێکی نەکرد نەفسی نەفیسم بە عینایەت**
**وەحشی لە ویلایەت**
**لەم گوٚشەیی ویرانەیە هەر مامەوە وەک بووم**
**وەیشوومی ولاتم**

**نەفس** : تەرکیباتی نەفس زوٚرە و نیزیکەی ٣٠ تەرکیبی هەیە، وەکوو : نەفسی ئەعلا، ئەممارە، ئینسانییە و حەیوانییە و رەحمانییە و هتد.....
لێرە «نالی» مەبەستی نەفسی نەفیس، یان نەفسی ئەعلایە کە کاری وریاکردنەوە و پەرەپێدانی حیسی ئینسانییە.

* واتە : نەفسی نەفیسی من عینایەت و تەوەجوٚهێکی نەکرد و من هەر لە حاڵەتی حەیوانییەت و وەحشییەتدا ماومەوە و هەر وەکوو کوندەبوو لە گوٚشەی وێرانەم و سەبەبی بەدبەختی وڵاتەکەمم.

* * *

**(٢٦٧) هەرچەندە کە من عەبدم و ڕووزەردم و عاصیم**
**مەئموولە خەلاصیم**
**قـوربـانـی بـیلالـم کـە هیلالانـە هـەڵاتـووم**
**هەر عەفـوە خەڵاتم**

**مەئموول :** چاوەڕوانی کراو، هومێدوار، ئارەزوومەند، چاوەڕێ بوون.
**بیلال :** سیلەی ڕوحم و چاکیەتی؛ «هو یراعی بلال». واتە ئەو سـیلەی ڕوحـم، موراعات دەکات.
«نالی» لە مەدینەیە و لە بارەگای پێغەمبـەر - درودی خـودای لـە سـەر بێ - دەپاڕێتەوە و دەڵێ :
* هەرچەند ئەمن بەندەیەکی گونابار و ڕووزەردی دەرگانـەی خـودای تـەعالام بـەڵام، ئارەزوومـەندی رزگـاریم بـە بۆنـەی تکـای پێغەمبـەری خۆشەویستەوە. هەرچەند وەکوو قووچێکی لەڕو و لاواز، وەکوو هیلالی مـانگ بێگیان و لەڕم و بۆ قوربانی ناشیم، بەڵام ئومەتی تۆم. هومێدی رزگاریم هەیە بـە بۆنەی سیلەی ڕوحم.

* * *

**(٢٦٨) مووددێکە کە هەم گەردشی دەورانی سوپیهرم**
**موغبیر بووە مێهرم**
**ئاوێنـەیـی دڵ شـاهیـدە هـەرچـەنـدە سیـەهـ ڕووم**
**مـیـرئـاتی جـەلاتم**

**موغبیر :** سیارەنگ، زۆر بارەندە، سەعی و کۆشش. تەقەلای زۆری کەسێك بـۆ جێبەجێ کردنی کارێك، مەغبەر هەڵەیە، موغبیر دروستە.
**مێهر :** خۆر، ویست، ڕوحم.
* واتە : دەمێکی زۆرە کە دەگەڵ چەرخی گەردووندا هاورێم بە خاسـە و خراپە. کە ویستم بە تەقەلا و کۆششە بۆ ئەوەی کە خۆم لـە خـراپـە رزگـار بکـەم. بـە ڕوورەشـیما مەڕوانـە تەماشای ئاوێنەی دڵم بکە کە ڕۆشن و

پاك و بێگەردە و مێهری تۆی تێدایە.

* * *

**(٢٧٥) سەراپا هەر وەکوو حەڵقەی زرێ، پەرویزەنی خوێنم**
**بە یەک‌یەک تیری موژگانی زرێ‌دۆزت بریندارم**

**پەرویزەن :** بێژنگ. پەرویزەن دروستە نە پەرویزە.

شەرحەکەی باش بوو.

* واتە : بە تیری موژگانی تۆ کە زرێش کون دەکات، سەراپای لەشم کون‌کون بووە و بریندارم.

* * *

**(٢٨٣) شەو هات و ئەمن مەستی خەیاڵاتی کەسێکم**
**مەشغووڵی نەفەس گرتنی موشکین نەفەسێکم**

**نەفەس گرتن :** ماندووی دەرکردن، لە هەرا و هوریا خستن، پشوودان و حەسانەوە، دەسەپاچەبوون، گیانە سەرکردن، بە پێ‌شێعرەکانی دواوە لێرە مەعنای ئەهوەن کردنەوە و لە هەرا و هوریا خستنی یارە.

* واتە : هەرچەند شەو هاتە سەرما و رۆژ تەواو بوو، بەڵام هێشتا من خەریکی ئەهوەن کردنەوەی یارە هەناسە بۆن‌خۆشەکەمم.

* * *

**(٢٨٧) باری غەمی جان ئەبرووە تی تیر و کەمان کرد**
**یەعنی قەدەکەی ئەلفی منە ئێستە کە دالم**

**باری :** خودای تەعالا، هەڵبەت، ناچار، دەس‌کەم و هتد ...

**تی :** تینوو، توو، دێت، تێغەی شمشێر و خنجەر، بە لاچاو تماشا کردن.

* واتە : بەراستی خەم و خەفەتی گیانی من برۆەکانیەتی، کە وەکوو تێخەی شمشێر خستوویە نێو کەمان بۆ گیانی من. بە واتای قەدی راستی من وەکوو «دال» بچەمێتەوە کە چەماندوویەتی.

* * *

**(٢٨٨) دەستم مەخە، سەرتا قەدەمم سووتووە چاوم**
**یا خۆ بە شیفا هاتـووی؟ چەندێکە ئەناڵم!**

**دەستم مەخە :** فریوم مەدە، دەس خڕەم مەکە، کڵاوم لە سەر مەنێ.
**سەرتا قەدەم :** ئازای ئەنامم، سەرتا پام.
**سووتووە :** سووتاوە.

* واتە : ئازیزەکەم! چاوەکەم! کڵاوم لەسەر مەنێ و فریـوم مـەدە. دەس خڕەم مەکەو ئەمڕۆ سۆزیم پێمەکە. تۆ کە دەزانی سەرتا پام لە بـەر دووری تـۆ سووتاوە و ئیتر گیانەڵا بووم. یان بێژی ئاهـ و ناڵەی دڵ کاری خۆی کـردووە و هاتووی بۆ دەرمانی دەرد و بیماریم و چارەکردنی ئازارەکانم.

* * *

**(٢٨٩) سایەیی پایە وەکوو باڵی هوما و بازی سپیم**
**نە وەکوو بوومی قەدەم شووم و نە هەمڕەنگی قەلم**

**سایە :** سێوەر، سێبەر.
**پایە :** بنەچە، بنەوە.
**هوما :** باڵندەی پیرۆز کە دەڵێن بنیشێتە سەرشان هەرکەسێکەوە یان سێبەری بـە سەریا بخات، ئەبێتە پادشا.
**بازی سپی :** جۆرە بازێکی زۆر بەنرخە، کینایەیە لە خۆر کە مەبەسـتی «نـالی» لێرە خۆرە، کە ڕۆشنی ئەخاتە سەر زەوی.
**هەمڕەنگی قەل :** ڕەشایی، کینایەیە لە ڕەشایی جەهل و نەزانی.
«نالی» بە خۆی و شان شـوکۆی خۆیـدا دێ دەڵـێ .(هـەروا کـە لەسـەرڕدێری شێعرەکە گوتوویە):

* من تەبعم بڵیندە و خاوەنی فـەڕ و زانسـتم. وەکـوو سـایەی هومـام. وەکوو خۆری عیلم و زانستم. پرشـنگدەرەوەم و لایقـی باڵانشـینیم. نـەوەکوو بایەقوش و کوندەبوو بەدفەڕ و شوومم، نە وەکوو شـەو لـە تـاریکی جـەهل و

نەزانیدام.

* * *

**(٢٩٠) کەوکەبەی طەلعەتی شاهانەیی تۆم بورهانە**

**کە لەسەر موددەعی، سوڵطانی موبینە جەدەلم**

**بورهان :** دەلیل و بەڵگە.

**طەلعەت :** پروومەت و رۆخسار.

**سوڵطانی موبین :** بەڵگە و بۆرهانی رۆشن و ئاشکرا.

**جەدەل :** شەرەقسە، سەختی و دوژمنی، زاڵ بوون بەسەر دوژمندا، دوژمنی پووچ و بێخود.

* واتە : شان و شکۆ و روخسار و روومەتی شاهانەی تۆ باشترین دەلیل و بەڵگەیە بۆ بەرپەرچ دانی ئەو ناحەز و لاف و گەزاف لێدەرە. چونکوو بۆ زاڵ بوون بە سەر ئەو ناحەزەدا بۆرهان و بەڵگەی رۆشنێکە.

* * *

**(٢٩٢) عاجیزی شوکری تەمامی نیعەمم سەرتا پا**

**کە نە ڕیش بەڵم و، نە کۆسەو، نە کەل و گۆج و شەلم**

**نیعەم :** جەمعی نیعمەت.

**ریش بەڵم :** ریش سپیی مەیلە و زەرد و فش وفوڵ.

**کەل :** کەچەڵ، «کل اگر طبیب بودی، سر خود دوا نمودی». واتە : «ئەگەر پزیشك ببوایە سەری خۆی دەرمان دەکرد» و لە کەچەڵی رزگار دەبوو.

* واتە : عاجیز و بێدەسەڵاتم و شوکرانە بژێری دەرگای خودای تەعالا بۆ من ناکری. بۆ ئەو هەموو نیعمەتانە کە بە منی عەتا فەرمووە، چونکوو نە ریشم فش و فوڵە و نە کۆسەی بێریش و بێمووم نە گەوج و لاسارم، نە کەچەڵم، نە شەل و بێدەست و پێ. شوکور ساغ و سلامەت، بێعەیب و نەقسم.

* * *

**(٢٩٢) «نالی»بو سینەیی بیٚکینەیی چاکم، ئەمما**
**چاکی دامەن‌تەڕم و وشکە سەرابی عەمەلم**

**ئەمما :** بەڵام.

**دامەن تەڕ:** (تر دامن)، وشەکە فارسیە، بە پیاوی ژن‌باز و ئەو کەسە کە دایم ها بە شوێن ژنانەوە و دەڵێن تەردامەن.

«نالی» هەروا کە لە شێعری پێشوودا گوتوویە و چاکیەکانی خۆی یەک‌بەیەك دەربڕیووە و هەڵیداوەتەوە. لە ئەو شێعرە درێژەی پیٚداوە و دەڵێ :

دڵ‌پاکم، بیٚکینەم و رقەون نیم. بەڵام بە ئەو هەموو چاکانەوە کە گوتم، ئەمەش بڵێم، کە داوێن‌تەڕم. واتە ژن‌بازم و دایم چاوم ها بە شوێن ژنانەوە!بە خاتری ئەوەیە کە سەرابی کردارم وشکە و گوناباری بە ظاهیر و، لە دوورەوە پیاوچاکم. هەروەکوو سەراو. (کە لە دوورەوە بۆ پیاوی تینوو، ئاوە. بەڵام لە نزیکەوە هیچ نیە). بەڵام خۆم بە باشی نازانم کە بەم جۆرە، یەکێ دیکە لە چاکی‌یەکانی خۆی، کە راستی و بیٚریایی‌یە دەربخا.

* * *

**(٣٠٣) من لە وانەم چی کەوا ئەهلی وەسیلە و مەسئەلەن**
**عامیل و ناچار و مەعذوور ئەر بڵێن هەربێنە بوٚم!**

**وەسیلە :** هۆ، سەبەب، بە خاتر، واسیتە و پارتی، ئەوشتەکە کە دەبێتە هۆی نزیکی بە دیگەرانەوە، بیانوو، هۆی خۆ نزیك کردنەوە بە خەڵك.

**مەسئەلە :** خواستن، خواهیش، پاڕانەوە، داوای شتێك کردن، پرسین، نیاز و حاجەت، گەدایی کردن.

**عامیل :** کرێکار، سەنعەتکار، کرێکاری ساختومان، زابت و نوٚکەری دەوڵەت، مەئموور یان حاکم و ئاغەوات، وەکیل و کارگوزار، داناوەز و بەردەست لە هەر کارێکدا :

**بە معزولی بە چشمم در نشستی　　　چو عامل گشتی، از من چشم بستی**

**«نظامی»**

واتە : ئەو کاتەی کە دەریان کردی و بێکار کرای، ئـەمنت لەسـەرچـاو دادەنا. ئێستا کە بووی بە عامیل، منت لە بیر برد، (چاوپۆشیت کرد).
**مەغذوور :** سەرزەنشت نەکراو، خاوەنی بیانوو، خاوەنی دەلیل و بورهان، پاسـا کردن، ئەوکەسە کە بیانووی قوبووڵ کرابێ.
* واتە : من کارم چیە بە سەر ئەوانە کە واسیتە و پارتیان هەیە. هـەروا ئەو کەسانەی کە نیاز و حاجەتیان هەیە و بە پاڕانەوە، داوای شتێك دەکەن. مـن عامیلم، مەئموورم و مەعذوور و ناچارم هەرچی بڵێن بە قسەیان بکەم.

* * *

**(٣٠٤) لامەدە «نالی» لە ئەنباری جیرایەی صاڵحان**
**گەرچی ببیە خۆشەچینی دانەیی خەرمانی ڕۆم**

**جێرایەی صاڵحان :** ئەو بەرات و راتبە و جێرەیە، کە بۆ پیاوچاکـان تـەرخان دەکرێ.
**خۆشەچین :** ئەو کەسانەی کە فەقیر و هەژار و نەدارن و دەرۆن پـاش مـاوەی گەنم و دەخڵ و دانێ کە لە جێ خەرمانانداندا بە جێدەمێـنێ خـڕ دەکەنـەوە و بـە شارۆ دەیبەن، پاشارۆکەر.
* مەبەستی «نالی» هەروا کە لە شێعری چوارەمدا گوتوویە : (ئینشـائەڵا دەرۆم. واتە : هەر لە وێ بمرێ و بڕوا بۆ ئەو دنیا)، ئەوەیە کە هەر لـە مەککـەدا بمێنێ و لەوێ بمرێ. هەرچەند هەژار و دەس کورت و نەدار بێت!

* * *

**(٣٠٦) مەجلیسێکی چەمەن و بولبول و بەزمی گوڵ و موڵ**
**بە دوو صەد مەدرەسەوو دەرس و کیتابی نادەم**

**موڵ :** شەراب، هەرخواردنەوەیەك کە مەستی بێنێ، قەهوە، شەرابی سوور.
گوڵ و موڵ پێکەوە کینایەیە لە بەهار.کە لێرە مەبەستی «نـالی» بـەهارە. بڕوانـە شەرحی «چو صائیقەیی بەردی عەجووز و گوڵ و موڵ هات». هـەرچـەند بـە

خاتری بەزم، مەعنای موڵیش بە شەراب مانیعی نیە، بەڵام چونکوو مەجلیسەکە چەمەن و بولبولی تێدایە چاکتری ئەوەیە کە گوڵ و موڵ بە بەهار مەعنا بکرێت.

* واتە : کاتی بەهارە و لە نێو چەمەن دام و بولبول بەزمی گرتووە و دەخوێنێ و زۆر خۆشە. کەوایە بە دووسەد مەدرەسە و کیتابخانە و دەرس و خوێندنی ناگۆڕمەوە.

* * *

**(٣٠٨) فاتیحە! تەسخیرە شاری دڵ، بە طابووری ئەلەم**
**موددەتێکی زۆرە پاتەختە، لە بۆ خاقانی غەم**

**فاتیحە :** تەواو بوو.
**تەسخیر :** داگیر کراو.
**طابوور :** کێو.
**ئەلەم :** دەرد و ئازار.

* واتە : خەم و پەژارە لە دڵما جێ خۆش کردووە و ئەوەندە زۆرە بە قەد کێوێکە.

* * *

**(٣٠٩) حوکمی قانوونی صەفارۆیی لە رەومی روومەدا**
**تا هوەیدا بوو لە رۆما گەردی ئاشووبی عەجەم**

**صەفا :** رۆشنی، پاکی، بێخەوشی، یەکرەنگی، ئاشتی.
**رەوم :** دارێکە، نەرمەی گوێ، مووی بەر، (لە تجوید دا خولەی سووك و کەم دەنگ)، خشە، ویستنی شتێك، کە مەبەستی «نالی» لێرە ویستنی شتێکە.

* واتە : هەر کە هێرشی عەجەم بە سەر رۆما دەستی پێکرا و ئاژاوە بەرپا بوو، ئێتر پاکی و بێخەوشی و یەکرەنگی نەما. من لە رووما نەهات داوای ئاشتی و یەکرەنگی بکەم.

**تێبینی :** وشەی عەجەم واتە بێگانە. وشەیەکی عەرەبیە. بەداخەوە بێخەبەران بە

ئێرانی دەڵێن عەجەم. ئەرکی سەرشانی نووسەران و ئەدیبانە کە دژ بە ئەو وشەیە راوەستن و لە نێو کوردان دا پاکی کەنەوە و ئێتر مەهابادی بە سەقزی و سەقزی بە سنەیی و هەروا لە خۆرنشینی کوردستاندا بەرەو خۆر هەڵات، هەر شارێك بە شارێکی دیکە نەڵێ عەجەم یان عەجەمۆك! بۆ ئەو مەبەستە، لە دەمقرە و دەمەتەقێیەکەی (مناظرە)، «نالی» و میرزای شیرازی چەند دێرێکم نووسیوە.

* * *

**(٣٠٩) تۆزی ئاییبنەی سکەندەر وا بە دەم باوە، وەلێ**

**گەردی دامانی غەریبانە، بلووری جامی جەم**

**وەلێ**: بەڵام، پیتی جیاوازیە، (ربط و استثنا).

ئەسکەندەر زاڵمیکی وێرانگەر بووە. جگە لە کوشتوبر و وێرانی و سووتاندن، کارێکی ئابادانی نەکردووە کە شوێنەوارێکی لێ بە جێ مابێ.

جەمشید، پادشایەکی ئێرانی بووە کە حەوتسەدساڵ پادشایی کردووە و زوڵم و ستەمی نەکردووە. هەرچەند تەواو پادشاکان زاڵم و ستەمکار بوون. جەمشید حەمامی بنیات نا. زانستی پزیشکی دامەزراند. جادە و رێگەی تەخت کرد. زێرو زیوی لە مەعدەن دەرهێنا و جلی حەریری دروست کرد. خاس و خراپی داوە و دەرمانی چێشت خۆشکەرە(ئەدویە)ی لێك جیا کردەوە. لە کتێبی «ناسخ‌التواریخ» نووسراوە لە سێسەد ساڵ دەورەی پاشایەتی ئەودا، کەس نەمرد. کە بوو بە هۆی کفری جەمشید و فەرمانی دا تابووتەکانیان شکاند و گوتی: من خودای ئێوەم! بەرلەو رووداوە زۆر بەدین و ئیمان بوو. هەر ئەو خۆپەرەستی و لە خۆبایی بوونە، بوو بە هۆی ئەوە کە خودای تەعالا، زەححاکی کردە تووشیەوە و لە ئاکامدا بە بەدبەختی و بێئیمانی گیانی دەرچوو. بەڵام شوێنەواری کارە چاکەکانی ماونەتەوە. بۆیە «نالی» دەڵێ :

* ئەسکەندەری زاڵم تێداچوو. ئاوێنەکەی شکاو ورد و خاش بوو. تۆزەکەشی نەما و با بردی. تەنیا وێرانگەرییەکەی لە بیر ناچێتەوە. هەرچەند

جامی جەمشید و جەمشیدی زاڵمیش تێدا چوو، بەڵام شوێنەوارەباشەکانی واتە ئابادانی و کارەچاکەکانی دەبینن. مەبەستی «نالی» ئەوەیە کە هەمووکەس چاك یان خراپ، دەمرێ. تەنیا نێوی چاکە، کە دەمێنێ. نێوی چاکیش شوێنەواری چاکە.

* * *

**(٣١١) کەی دەکا شەرح و بەیاناتی، رمووزی دەردی دڵ**
**ڕووڕەشێ هەر وەک دەوات و دوو زوبانێ وەک قەڵەم**

باوە کە دەڵێن : «کاکە گیان ئەوەندە دەردم گران و زۆرە کە نە بە نووسین دێ و، نە زوبان توانای وتنەوەی دەردەکانی هەیە»! کە مەبەستی «نالی» لێرە ئەوەیە:

* دەردی نهێنیەکانی ئەوەندە زۆرە کە قەڵەم توانای نووسینی ئەو هەموو دەردانەی نیە و زوبانیش هێزی وتنەوەی.

* * *

**(٣١١) «نالیا» بێهیمەتی تاکەی بە دەست میحنەتتەوە**
**فاتیحی‌یو ڕۆستەم‌ئاسا، صاحیبی تێغ و عەلەم**

**فاتیح :** کردنەوە، داگیر کردن، زاڵ بوون بە سەر شتێکدا.

**صاحیبی تێغ و عەلەم :** کینایەیە لە لێهاتوویی، توانا بوون، خاوەنی عیلم و زانست.

* واتە : «نالی»، ئەوە بۆ خۆت گیرۆدەی دەست دەرد و ئازار کردووە و دایە خەریکی خەفەت خواردنی؟ ئەتۆ لێهاتووی هەستە وەکوو ڕۆستەم کە دایە فاتیح و زاڵبووە بە سەر ڕووداوەکاندا، ئەتۆش زاڵ بە بەسەر دەرد و نارەحەتی‌یەوە و ئیتر خەم مەخۆ. ئەتۆ خاوەنی عیلم و زانستی.

* * *

**(٣١٣) سوی مصر است مرا عزم از این لجەی غم**
**تا کە در نیل درکشم جامە ز بیداد و ستم**

**جامه در نیل زدن یا کشیدن :** ناهومێ بوون، جلـی ئازیـەتی لەبـەر کـردن، ئازیەت بار بوون.
**لجه :** بانگ وهەراو هوریا و قرم وقاڵ.
وا دیارە «نالی» لەو جێگەیە کە ئەو شێعرەی گوتووە، یان کوردستانێ کە ئـاژاوە و قرم وقاڵی لێ پەیدا بووە و زوڵم و زۆری دیوە و ئیتر توانای دیتنی ئەو هەموو زوڵم و ستەمەی نەبووە دەڵێ :
* برۆم بۆ وڵاتی «میصر» کە نیلی هەیە و لەبـەر ئـەو هـەموو بێـداد و زوڵمە، جلی ماتەم و عەزا لەبەرکەم و ئازیەت بار بم!
* * *
**(٣٢٣) ئەهلی تەعدادی مەحاسین نووسییان**
**خاڵ یەک و زولفی دووان، هەردوو سییان**
**تەعداد :** ژماردن و ژمارە کردن.
**مەحاسین :** جەمعی حوسنە، واتە : چاکیەکان و جوانیەکان.
**سیان :** سێن، سێ دانەن، سیاهن واتە رەشن.
* واتـە : ئـەو کەسـانەی کـە بـە دوای جوانیـدان و چاکی‌یـەکان و جوانی‌یەکان ئەژمێرن، نووسیویانە یار خاڵێکی هەیە. ئەوە یەك. زوڵفیشی هەیـە. ئەوە دوو. کە هەردووکیان رەشن.
* * *
**(٣٢٨) چ قەصر و دائیرە و تاقێ تیا تۆ تاقی ئافاقی**
**نەی و موطریب، مەی و ساقی، گوڵ و بولبول هەموو جووتن**
**چ :** هەر، کام.
**دائیرە :** باخ و باخچەی دەوری ماڵ.
**تاق :** تاقی سەر درگا و پەنجەرە، هەیوان، دژی جووت.
**تاقانە :** بێ‌وێنە، تاق دژی جووت، پێکەوە بوون، ئامادە بوون.
**ئافاق :** دنیا.

دەزانین لە نێوان نەی و موطریب، مەی و ساقی، گوڵ و بولبول، تەناسوب هەیە و بە واتای پێکەوەبوون و ئامادەبوونە.

* واتە : ئازیزەکەم! ئەتۆ لە ئەو دونیایەدا و لە هەر کۆشك و سەرا و تەلارێکدا و لە هەر باخ و باخچەیەك و لە هەر هەیوان و سەرایەکدا، تاقانە و بێوێنەی و بە بۆنەی تۆوە نەی و موتریب، مەی و مەیگێڕ و گوڵ و بولبول کۆ دەبنەوە و جووت جووت، بۆ تۆی تاقانەی بێوینە ئامادەی بەزمگێڕی و خۆش رابواردنن.

* * *

**(٣٢٩) لە شەوقی روویی شەمع و، زولفی دوود و طوررەیی مەجمەر**
**سوپەند و، عوود و، پەروانە، بخوور و غالییە سووتن**

**شەمع :** مۆم.

**دوود :** دووکەڵ و کینایەیە لە رەشی.

**طوررە :** کنار و لێوی شتێك، ئەگریجە، ریشووڵەی مێزەرو پشتێن، بارانگیر لە سەر دەرگاو دەروازە (طوررەی هەیوان و داڵان)، تازیانە.

**مەجمەر :** مەنگەڵ، پشکۆدان، جێگەی ئاگر و سکڵ و پەنگەر :

**یکی مجمر آتش بیاورد باز　　　بگفت از بهشت آوریدم فراز**
**«فردوسی»**

واتە : مەنگەڵێ ئاگری هێنا و گوتی ئەوەمە لە بەهەشت هێناوە.

**سوپەند :** قانگ.

**عوود :** دارێکی بۆن خۆشە .

**غالییە :** موئەنیسی غالی، واتە گرانبەها، بۆنێکی خۆشی هەیە کە لە تێکەڵاو کردنی مێسك و عەنبەر و چەند دەرمانێکی دیکە دروست دەبێ و رەنگی رەشە، وەکوو خەنە دەیگرنە سەر بۆ موو رەش کردن و بۆن خۆشی.

* واتە : لە ورشە و تیشك و رووناکی روخسارە وەك مۆمە رۆشنەکەی و زوڵفی وەکوو دووکەڵی رەش و پرچ و ئەگریجەی بریقەداری، قانگ و

عوود و پەروانە و مێسك و عەنبەری گرانبەها، لە ڕەونەق کەوتن و سووتان و تیاچوون.

* * *

**(٣٣١) ئەم سەرسەری بازانە کەوا هەمسەری بوومن**
**موشکیل، بگەنە ساعیدی شاهێکی وەکوو من**

**سەرسەری باز :** شەخسی بێبایەخ و بێکارە و نەگبەت.
**هەمسەر :** هاوشان، هاوسەر و هاوتا.
**بووم :** بایەقوش، نەگبەت.
**ساعید :** باسك، قوڵ جێگەی هاتنە خواری شیر لە مەمك. جێگەی ڕۆیشتنی مەغز لە نێو ئێسقان، جێگە وجۆباری ئاو کە دەرژێتە نێو دەریا، لە کن دەروێشان و سۆفیان هێز و قووەت، لێرە مەبەست شان و قوڵە، واتە هاوشانی کردن.
«نالی» بە زوبانی یارەوە و بە شان و قوڵی یاردا، دەڵێ :

* ئەو بێنرخانە ونەگبەتانە کە هاوشانی بایەقوشن، لە بێبایەخی و شوومی دا، بە زەحمەت بتوانن لەگەڵ مندا کە دارای شان و شکۆی شاهانەم بەرابەری بکەن. ئەوانە زۆر بێبایەخن. من زۆر بەرز و بەفەڕم.

* * *

**(٣٣١) ڕووناکیی ڕوو، شەوقە لە نێو ظوڵمەتی موودا**
**وەجهی ئەمەتە، دڵ هەموو پەروانەیی موومن**

**ظوڵمەت :** تاریکی.
**وەجهە :** هۆ.

دەزانین کە پەروانە، شەوانە حەز لە شەوق و شوڵەی شەمدەکا. «نالی» زوڵفی یارەکەی کە زۆر ڕەشە، بە شەو، شوبهاندوە و ڕووناکی و شەوقی ڕوخساری، بە مۆم. دڵدارانیشی بە پەروانە شوبهاندوە و دەڵێ :

* ئەو هەموو دڵدارانە بە دەوری ڕوخساری یارەوە، هۆی ئەوەیە کە چون پەروانە دایە ها بە دەورشوڵەی شەمەوە تاکوو بسووتێ، ئەوانیش گیرۆدەی

ڕوخسارە جوانەکەی یارن لە نێو زوڵفی ڕەشی دا.

* * *

**(٣٣٢) من سەروی ڕەوانی چەمەنی عالەمی باڵام**

**«نالی» بە طوفەیلی بووەتە سایە لە دوو من**

**عالەمی باڵا :** ئاسمان، جیهانی گیان کە دوورە لە هەموو ویستی دنیایی، عالەمی زۆربەرز، لێرە مەبەست زۆر بەرز و بەشان و شکۆیە.

**طوفەیلی :** لاپلار، لاپواز، ئەوکەسانە کە بە خۆڕایی و ڕووداری خۆیان هەڵواسن بە کەسێکدا.

**سایە لە دوو :** ئەو کەسە کە دائیە ها بە شوێن کەسێکی دیکەوە.

* واتە : من سەروی باڵابەرزی زۆربەرز و بەشان و شکۆم و هاوشانی هەموو کەسێك نیم. «نالی» پیاوێك لاپلارە و دائیە وەکوو سێبەر بە شوێنی منەویە.

* * *

**(٣٣٣) دووری لە من خستەوە بێ‌سەبەبێ یاری من**

**باری خودایا کە تۆ، بگری سەبەبکاری من**

**باری :** خودای تەعالا، ئەڵبەتە، ناچار، ئێستا کە وایە، دەس‌کەم، لائەقەل:

**«گو چشم خدای بین نداری باری، خورشید پرست شو، نه گوساله پرست»!**
**«ابوسعید ابی‌الخیر»**

واتە : ئەگەر چاوی دیتنی خودات نیە و خوداپەرست نیت، لانی‌کەم، خۆرپەرست بە، نە گوێرەکە پەرست.

* واتە : یەزدانی مەزن! ئێستا کە ئەو سەبەبکارەی چوکوڵ شکێنە، بێ‌ئەوەی کە من سووچێکم هەبێ، هەروا لە خۆڕا یاری لێ دوور خستمەوە و هۆی ناحەزی نێوان من و یارەکەم بووە. خودایا هەر هیچ نەبێ ئەو سەبەبکارە تووشیاری خەم وخەفەت بکە و بیگرە بەر غەزەبی خۆت.

* * *

**(٣٣٤) دیده نیگەهبانی یار، تیپی سریشکم هەزار**
**ناڵەیی دڵ نەی سەوار، ئاهە عەلەمداری من**

**نیگەهبان :** چاودێری‌کەر، پاسەوان.
**نەی سەوار :** ئەو منداڵە کە چێو، یان نەی‌قامیش یان توولّی تەڕ ئەکاتە ئەسپ و ئەیخاتە نێو لنگی و بە خەیاڵی خۆی سواری ئەسپە و سواری ئەکا :
**چون طفل نی‌سوار، به میدان اختیار**
**در چشم خود سواره و لیکن پیادەایم**
**«صائب تبریزی»**

واتە : وەکوو منداڵی نەی‌سوار لە مەیندانی ئیختیاردا، لە لای خۆمەوە بە خەیاڵی خۆم سوارم. بەڵام پیادەم!
**عەلەمدار :** ئاڵا هەڵگر.

* واتە : چاوەکانم پاسەوان و پارێزگەری یارە و دایمە چاوم لێیە نەکا تووشی زیانێك بێ. سوپای فرمێسکیش بە خور و فراوانی دێتە خوار. کە ئاوپژێنی ڕێگای یار بکا تاکوو تۆزی لێ نەنیشێ. ناڵەی دڵیش،کە تەنیا خۆم پێ‌ئەزانم و کەسی دیکەش ئاگاداری ناڵەی دڵی من نیە، وەکوو ئەو منداڵەیە کە توولّی تەڕ، یان قامیشی خستووە نێو لنگی و بە خەیاڵی خۆی سوارە. بەڵام پیادەیە. لەبەر یارم ڕم‌بازی ئەکات و ئاڵا هەڵگرەکەی ئەو سوپای هەزارەش، ئاهە بڵیندەکەی منە کە دەگاتە گەردوون.

* * *

**(٣٣٦) مەشرەبی «نالی» گەلێ ئابی‌یو ترشە، بەلێ**
**موعتەریفە، خۆی دەڵێ : چانییە ئەطورای من**

**مەشرەب :** خوو، ڕەوشت.
**گەلێ :** کەمێك، میقدارێك.
**ئابی :** توورە و ڕقەون، درژی هێمن، کەسێك کە ئارام و خۆڕاگر و هێمن و لەسەر خۆ بێت پێ‌دەڵێن کابرا، پیاوێکی خاکیە. واتە هێمنە و ئارام. دژی

خاکیش ئابیە.

**موعتەریف :** کەسێك کە دان بە خراپەی خۆی دابنێ.

* واتە : خوو و رەوشتی من تۆزێ توورەیی و ترشی تێدایـە و دان بـە ئەو توورەیی و رووگرژی خۆمە دادەنێم و قوبووڵ دەکەم کە هێمن نیم و تـوورە و رقەونم و خوو رەوشتم باش نیە.

* * *

## (٣٣٧) خەندە و دەمی «مەحبووبە»، کە وا زۆر نمەکینن
## بەس خۆشە ئەگەر خۆ نمەکی زەخم و برینن

**خەندە :** پێکەنین.

**نمەکین :** خوێئاوی، شۆر، قسەخۆش، جوان، دلڕفێن، (ملیح، ملیحە، مطبوع).

بۆ لێکدانەوەی ئەو شێعرە، پێویستە میسالێك بدەم : ئەگەر کەسێك تینوو نـەبێ و چاوی بکەوێتە ئاو دەربەس نیە و ناراحەت نابێ. بەڵام ئەگەر تینوویەك ئاو ببینێ و نەتوانێ خۆی تێرئاو بکا نارەحەت دەبێ.

«نالی» دەڵێ :

* دیتنی پێکەنینی یار بەو دەمە زۆر جوان و نمەکین و دلڕفێنە، بو عاشق زۆرخۆشە. بەڵام کاتێ نەتوانێ کەڵکی لێوەرگرێ، جگە لەوەی کـە زامـی دڵـی دەکولێنێتەوە، سوودێکی نیە و وەك ئەوەیە کە خوێ بڕژێنێتە بان زامی دڵدا.

* * *

## (٣٣٧) غەڵطانەگوتم، خاڵی لەطیفت، کە لەسەردا
## ئەم قیبلە برۆیانە کە غارەتگەری دینن

لە شەرحی مامۆستا «عەبدولکەریمی مودەرریس»، غیلمان بوو، کـە بـە هەڵـەی نووسیار دامنا. دروستەکەی «غیلمان» جەمعی غوڵامە، نە غوڵامی رەش. بەڵکوو غولامی بێموو. سادە و جوان و ئەمرەد کە لە بەهەشتن. لێرە غەڵطان دروســتە.

کە سیفەتی خاڵی لەتیفە :

**صد بوسه بر آن خال زد و گفت در آنجا**

**سیصد درم عدلی غلطان و مدور**

واتە : سەدجار ماچی خاڵەکەی کرد و گوتی سێسەد دێرهەمی عەدلی‌یی نەرم و ساف و سادە و خریلە لەوەێ دایە.

**غەڵطان :** ساف و بێگری، خرت و گرد کە ئاوەڵ ناوی خاڵی لەطیفە.

**لەطیف :** باریك، ناسك، زۆر ناسك و لە رادەبەدەر جوان و باش و ناسك.

**کە :** بە جۆرێك، هەروا.

**لەسەردا :** لە ئەسڵدا، لە بنەڕەتدا، بە تەواوی.

* واتە : ئەم خاڵە خڕ و جوان و ساف و بێگەردانە، بڕۆ ناسك و لەرادەبەدەر جوان و باشە، لە بنەڕەتدا و بەتەواوی تاڵانکەری دینن. چونکوو هەر ئەوەندە جوانن کە بە دیتنیان دڵ و دین، بەتاڵان دەڕوا.

* * *

**(٣٣٨) سیمین‌بەدەن و سەروقەد و لەنجە تەذەرون**

**کافر نیگەهـ و ڕەشک، لە بوتخانەیی چینن**

**سیمین‌بەدەن :** بەدەن سپی.

**سەرو قەد :** باڵابەرزو ڕێك‌وپێك.

**تەذەرو :** لە راستەی مامرەکانە، کەڵەشێری کێوی، قەرقاوڵ، لە کەو گەورەترە، وەکوو کەو بەلەنجە و لارە.

**کافیر نیگەهـ :** ئەو کەسەی بێڕەحمانە تەماشای کەسێك بکا.

**ڕەشک :** حەسوودی و بەخیلی، ریقابەت، چاولێگەری.

**بوتخانەی چین :** عیبادەتگای چین، بەهاری چینەکان، مەجازەن ئەندەروون و جێگای مەعشووقەکانی پادشاکان و گەورەکان، جیگایێ کە رەسمی جوانی تێدا بووە.

* واتە : لەشیان سپیەو باڵابەرزن و وەکوو تەزەرو بەلەنجە و لارن و تەماشاکردنیان بێ‌ڕەحمانەیە و لەگەڵ ئەندەروونی ژنە جوانەکانی چین، ڕیقابەت دەکەن.

* * *

**(٣٤١) صەف‌صەف کە دەوەستن، بە نەظەر خەططی شوعاعن**
**حەڵقە کە دەبەستن، وەکوو خەرمانەیی ماهن**

**بەنەظەر :** لەبەر چاو.

**خەططی شوعاع :** لە عیلمی هیندسەدا کورت‌ترین و راست‌ترین خەتێ کە لە ناوەندی دایرەوە بۆ دەوری دایرە(محیط)، بکێشرێت، شوعاعی پێ‌دەڵێن.

* واتە : کاتێك ریز دەبەستن، وەکوو شوعاعی دایرەن کە زۆر راست و ڕێکن. حەڵقەیش کە دەبەستن وەکوو ئاخڵەی مانگن. کە ئەوەش دەور و کەمەی دایرەکەیە. کە زۆر ڕێکەو لە ناوەندەوە بۆ هەموو نوقتەیەك بە یەك ئەندازەیە.

* * *

**(٣٤١) نەرگس نیگەهـو ساق سەمەن، کورتە بەنەفشەن**
**موو سونبول و روومەت گوڵ و، هەم لالە کولاهن**

**نەرگیس نیگەهـ :** چاو بە خومار.

**ساق :** پووز، پویز، لەتەر، نێوان زرانی و قولە قاپە.

**ساق سەمەن :** پووز سپی:

**بیابان همه خیل قبچاق دید**      **در و لعبتان سمن‌ساق دید**
**«نظامی گنجوی»**

واتە : تەواو بیابان پڕ بوو لە خێڵی قبچاق کە لە ناویاندا نازدارانی زۆری پووز سپی، دەبەر چاو دەکەوت.

* واتە : چاوبەخومارن و بە لەنجەولارن و پووزسپی. وەکوو وەنەوشە

خۆش‌ڕەنگ و بۆن. زوڵفیان وەکوو سونبول خاو و جوانە و ڕوومەتیان وەکوو گوڵە. کڵاوی سووریان لەسەرە کە زۆر جوانە.

* * *

**(٣٤٢) گوڵزاری دەر و دەشتن و غیلمانی بەهەشتن**
**ئاهوو صەف و ئاتەش بە کەف و تیز نیگاهن**

**غیلمان :** کوڕە جوانەکانی بەهەشت، مەبەست لێرە ئەوپەڕی جوانی‌یە.
**ئاهوو صەف :** زۆر ڕێك و پێك.
**تیز نیگاهـ :** تووڕە، چاوتیژ.

**از نگاه تیز هرجا ترک چشمت تیر ریخت**
**از دل و جان و به سر هم، یک جهان نخجیر ریخت**

واتە : بە تەماشاکردنی بە تووڕەیەوە، لە هەر کوێ تیرێکی پەڕاند، هەم گیان و هەم دڵی خەڵکی بە ئەندازەی یەك دنیا شکاری کرد و گیرۆدەی خۆی کرد.

* واتە : ئەو کوڕە جوانانە کە وەکوو غیلمانی بەهەشتن، کاتی دەردەکەون، هەروەکوو گوڵ، دەر و دەشت دەڕازێننەوە و ڕیز گرتنیانیش وەکوو ئاسك ڕێك‌وپێکە و هەموویان تفەنگ بە دەستن و لە کاتی جەنگ‌دا هەتا بڵێی بە غەزەب و تووڕەن و توند و تیژن.

* * *

**(٣٤٣) گەهـ طاوس و گەهـ کەبکن و گەهـ بۆقەلەموونن**
**گەهـ ئاتەش و گەهـ شوعلە، گەهێ دوودی سیاهن**

بۆ لێکدانەوەی ئەو شێعرە، پێویستە بزانین وشەکانی: *طاووس، کەبك، بۆقەلەموون، ئاتەش، شوعلە، دوودی سیاه* یا خودی دوود بەچی شوبهێندراوە:

**طاوس :** بە فیز و دەمار ، خۆ پەسەند کردن.

**کەبک :** خۆش‌ڕەفتار و بەلار و لەنجە.
**بۆقەلەموون :** بێ ڕەنگی و ڕەنگاوڕەنگی و هەرساتێ بە ڕەنگێ دەرکەوتن، ریاکاری.
**ئاتەش :** نوور، تووڕەیی و کینایەیە لە پیاوی شوجاع و نەبەز.
**شوعلە :** بڵێسە، کینایەیە لە پیاوی سەرکیش و بێباك و نەترس.
**دوود :** دووکەڵ و کینایەیە لە چالاکی و پڕتاوی :

**هم اندر زمان گیو برجست زود**
**شتابید از ایدر به توران چو دود**
**«فردوسی»**

واتە : گیوی گوودەرز، دەس بەجێ و زۆر بەپەلە هەستاو کەوتە رێ، لێرەوە بۆ تووران. وەکوو دووکەڵ. واتە بە پڕتاوی.

* واتە : کوڕەکانی دەور و بەری پاشا، وەکوو بۆقەلەموون و عەلیشیشن و هەر سات و کاتێ خۆیان بە ڕەنگێ دەردێنن. جارێ وەکوو طاوس بە فیز و دەمارن. جارێ وەکوو کەو بەلەنجەولار و خۆش‌ڕەفتارن. جارێ وەکوو ئاگر دڵێر و نەبەز و کۆڵنەدەرن. جارێ وەکوو شوعلە سەرکیش و نەترسن و جارێکیش وەکوو دوود توند و چالاك و سەریع و بەبڕفانن.

* * *

**(٣٤٤) تەنهایی سەمەن، بەرگی بەنەوشە کە لەبەرکەن**
**وەک نووری دلی موئمین و ظولماتی گوناهن**

**تەنهایی سەمەن :** سپی لەشەکان.
**بەنەوشە :** وەنەوشە (بنفشەی فارسی)،ڕەنگی شینی زۆرڕەش، کەبود، کەوەی دێز.

**سرو بن چون به شصت سال رسید**
**یاسمن بر سر بنفشه دمید**
**«نظامی»**

واتە : کاتێ تەمەنی گەیشتە شەست ساڵ، مووە رەشەکانی سپی بووە.

**بدستەبندی سوی بنفشه مویان رو**
**مرو بباغچەی سنبل! کدام مرزنجوش؟**

واتە : برِو نێو دەستەی موورەشەکان. واتە جەوانەکان. مەرِۆ بۆ نێو باخ. سونبولی چی و مەرزەنجووشی چی؟

* واتە : ئەو لەش سپیانە جل و بەرگی وەنەوشەیی رەنگ، کەمەیلەو رەشە لەبەر کەن. هەر وەکوو دڵی رۆشن و نوورانی خوداناسێ کە رەشایی گوناح داپۆشی بێ.

* * *

**(٣٤٧) لە سەر بەرگی گوڵێکی باغی حوسنت**
**هەزار، گوڵچینی بێبەرگ ونەوا، چین!؟**

**بەرگ و نەوا :** جل و بەرگ، خواردەمەنی، ئەسپاوی ژیانی ناو ماڵ.
**بێبەرگ و نەوا :** کەسێك کە جلوبەرگ و ئەسپاوی ژیانی نەبێت، فەقیر و هەژار.

* واتە : لە سەر گوڵێکی جوانی روخسارت، ئەو هەزار هەزار گوڵچینی فەقیر و هەژارە چ دەکەن؟

مەبەستی «نالی» لە هەژار و فەقیر، ئەو عاشقانەن کە بە دەور و بەری یاردا، دێن و دەچن.

* * *

**(٣٥٢) مەفەرموو دڵ وەکوو ئاوێنە صافە**
**بەڵێ بەم ئایینە بۆوە بووی بە خۆدبین**

* واتە : مەفەرموو کە دڵت وەکوو ئاوێنە پاك و ساف و بێگەردە. بەڵێ

بێگومان ئاوێنە ساف و پاك و بێگەردە و دڵی تۆش هەر وەکوو ئاوێنەکە پاك و بێگەردە. بەڵام ئەوەندە تەماشای ڕۆخسارە جوانەکەی خۆتت کرد و هەر لە ئاوێنەکەدا خۆتت دی و کەسی کە نەبوو، ئەو خودبینی‌یە کەم‌کەم بووە هۆی ئەوەی کە خۆدبینت لێ دەرچێ.

* * *

**(٣٧٥) دڵ شیشەیی پڕخوێنی فیراقی فەرەقی بوو**

**مەکسووری ڕقی بەو دڵی وەک بەردێ ڕەقی بوو**

**فەرەق :** پێوانەیەکە لە مەدینە، بەرانبەر بە شانزدە ڕەتڵ یان سی‌ساع یان چوار ئیرباع.

* واتە : لە دووری و هیجرانی یارە جوانەکەم شووشەی دڵم ئەوەندە پڕبووە لە خوێن کە بە ئەندازەی یەك فەرەقی مەدینە خوێنی تێدا بوو. ئینجا ئەم دڵە پڕ خوێنەم بە بەردێ سەخت و ڕەقی دڵە بێ‌ڕەحم و ڕقەونەکەی ئەو یارە شکاوە و خوێنی لێ دێ.

* * *

**(٣٧٦) ئەو نەشئە کە وا ساقی منی پێ لە خودی سەند**

**نەک نەوعەرەقێ بوو، کە قەطرەی عەرەقێ بوو**

**نەو :** تازە.

**نەو عەرەق :** شەرابی تازە کە نەشئەو گیرایی لە شەرابی کۆن، کەمترە.

**قەطرەی عەرەق :** چکەی عارەقی دەم چاو، تەقتیری دووبارەی عارەق یان عارەق لە شەراب.

* واتە : ئەو عارەقە، یان ئەو شەرابە کە مەیگێڕ بە منی دا و منی گێژ و وڕ و مەست و لەخۆ بێخودی کردم و هۆشی لێ ئەستاندم، شەرابی تازە نەبوو. ئەو عارەقە لە تەقتیری عارەقی گوڵی روخساری یار بە دەست هاتبوو و لە شەرابە کۆنەکەش گیراتر و و بە نەشئەتر بوو. ئەوە بوو کە وا منی مەست کرد و

هۆشی لێ ئەستاندم.

* * *

**(٣٧٦) خەندەی نەفەسی تۆ بوو وەکوو صوبح و نەسیمی**
**یا گوڵ دەمی پشکووتن و عەطری وەرەقی بوو**

**وەرەق :** بەرگ، روخساری یار، (ورق: رخسار یار، برای پوستهای نازك، (دهخدا)).

* واتە : پێکەنین و بڵاوبوونەوەی هەناسەی بۆن خۆشی وەکوو سروەی دەمەبەیانی تۆی خوشەویست بوو یا خودی گوڵی روخسارە جوانەکەت بوو، کە پشکووتن و بۆن و بەرامەیەکی زۆر کەوتە ئەو ناوەندە.(رۆخساری یار بە گوڵ، هەناسەکەی بە سروەی دەم بەیان و ددانە سپیەکانی، بە رۆشن کەرەوەی ئاسۆ شوبهێندراوە).

* * *

**(٣٧٧) رەققێتیی تەن و ریققەتی دڵ روقبەتی طاعەت**
**مەخصووصی رەقیب بوو لە منی خەستە رقی بوو**

**رەق :** ناسکی پێستی لەش.
**ریققەت :** دڵنەرمی، رۆحم، بەزەیی، دڵناسکی.
**روقبەت :** مەکۆی نێچیری پەڵەنگ، هەروا کە «زەیبە» سەنگەری شکاری شێرە.

* واتە : ناسکی و نازاری پێستی لەشە جوانەکەی یار کە غارەتگەری دینەو مەکۆی نێچیری ئەویندارانی وەك پەڵەنگە بۆ بە داو خستنیان و دین و دنیا لێ ئەستاندیان، کە تایبەتی بەدکارەکەی من بوو، لەبەر ئەوەی کە لە منی خەستەی کوڵوڵی هەژار رقی بوو، برا بە باڵای مندا و دین و دنیای لێ ئەستاندم.

* * *

**(٣٧٨) «نالی»، لە هەوا کەوتە سەما بوو بە شەناوەر**
**بەو وشکە مەلە، بیمی هیلاکی غەرەقی بوو**

**هەوا :** گازێکی بێڕەنگ و بۆ، هۆی، مەیل و ئارەزوو، هەواو هەوەس.
**شەناوەر :** مەلەوانی، چالاك و فرز، بێباك و نەترس.
**غەرق :** نوقوم بوون، تێداچوون، سەرەو خوار بوون، کەشێش و شەیدایی.
**وشکە مەلە :** مەلەی بەخەیاڵ.

* واتە : نالی بەخەیاڵ و ئارەزوو کەوتە سەما کردن و هەڵپەڕکێ. بوو بە مەلەوانی نەترس و بێباك. بە جۆرێ کە ترسی تیاچوونی هەبوو!

* * *

**(٣٧٨) «نالی»، لە هەوا کەوتە سەما بوو بە شەناوەر**
**بەو وشکە مەلە، بیمی هیلاکی غەرەقی بوو**

**هەوا :** گازێکی بێڕەنگ و بۆ، هۆی، مەیل و ئارەزوو، هەواو هەوەس.
**شەناوەر :** مەلەوانی، چالاك و فرز، بێباك و نەترس.
**غەرق :** نوقوم بوون، تێداچوون، سەرەو خوار بوون، کەشێش و شەیدایی.
**وشکە مەلە :** مەلەی بەخەیاڵ.

* واتە : نالی بەخەیاڵ و ئارەزوو کەوتە سەما کردن و هەڵپەڕکێ. بوو بە مەلەوانی نەترس و بێباك. بە جۆرێ کە ترسی تیاچوونی هەبوو!

* * *

**(٣٨٢) لە کن تۆ، خارو خەس، گوڵزارە بێ من**
**لە کن من، خەرمەنی گوڵ، خارە بێ تۆ**

ئەو شێعرە جگە لە وشەی «خەس» کە بە «وشتر خوار» مەعنا کراوەتەوە، شەرحەکەی باش بوو. بەڵام چونکوو مەعنای «خەس»م بەلاوە نارەسا هات ئەو شێعرە لێك دەدەمەوە :

**خار:** دڕك، دڕك و داڵ.

**خەس :** وردە گیا و کا، پەل و پووش.
**خار و خەس :** درِك و داڵ.
«نالی» دەڵێ :
* ئازیزەکەم! ئەوەندە لە من بێزار و دوورەپەرێزی بەو مەرجەی من لە کنت نەبم درك و داڵ بۆ تۆ دەبێتە گوڵزار. بەڵام منی بەدبەخت ئەوەندە تۆم خۆش‌دەوێ کە ئەگەر تۆ لە کن من نەبی خەرمانی گوڵ یان گوڵزار، بۆ من درکی ناژی.

* * *

**(٣٨٨) دڵم وەک حاکمی مەعزووڵە قوربان!**
**خەڵاتی وەصڵی تۆی مەنظوورە ئەمشەو**

فەرماندارێك کە لە کار بەرکناری بکەن، بۆ دڵنوایی و نەختێ دڵ خۆشی دانەوەی،کۆڕێکی بۆ دەبەستن و نەختێ لەو کارانە کە کردوویەتی پەسند دەکەن و خەڵاتێکی پێ‌دەدەن، کە تۆزێ لە خەفەتی بەرکناری‌یەکەی کەم ببێتەوە. «نالی» دەڵێ :
* قوربان ئێستا کە منت عەزل کردووە ـ بەرکنار کراوم ـ دەبێ خەڵاتم پێ‌بدەی. ئەو خەڵاتەش تەنیا وەسڵی تۆیە و تەواو.

* * *

**(٣٨٩) لە خەو هەڵساوە، یا ئاڵۆزە چاوت؟**
**هەمیشە وایە، یا مەخموورە ئەمشەو؟**

**ئاڵۆز :** توورە، تێك هاڵاو، پەرێشان، کە بە بۆنەی خەواڵوویی و مەخمووری مەبەست تێك چوون و تێك هاڵاویە، نە توورەیی.
* واتە : ئازیزەکەم! هەرچەند تەماشا دەکەم، دەبینم چاوت تێك‌چووە و منی سەرسام خستووە. نازانم تازە لە خەو هەستاوی یان دائیمە چاوت وایە؟ یان نا، ئەمشەو چاوت خومار کردووە.

* * *

**(٣٩١) ساقی قەدەحی گەردشی گەردوون دەشکێنێ**
**باری کە دەبێ موعتەقیدی گەردشی ئەو بە!**

**قەدەح شکاندن :** ریسوا کردن، تانە لێدان.
**باری :** خودا، ئەڵبەتە، ناچار، ئێستا کە وایە، دەس‌کەم، لائەقەل.

* واتە : مەیگێڕ ئەوە بۆ تانە و توانج لە گەردوون دەدەی و هەر کارە خراپەکان و ریسوایەکان دەخەیتە مل گەردوون؟ ناچار دەبێ قوبووڵ بکەی کە هەڵ دەکەوێ جارێکیش گەردوون بە دژی تۆ بخولێتەوە.

* * *

**(٣٩٣) ئەسپی نەفەست دێت و دەچێ گەرمە عەنانی**
**ئەی مەستی ریاضەت، هەلە! هوشیاری جڵەو بە**

**گەرم عەنان :** غاردان، بە برِفان رۆیشتن.

**هەلە :** وشەی ئاگاداری، واتە ئەهای.
لە تەواوی شێعرەکە، «نالی» لەگەڵ نەفسی خۆی شەریە و دەیەوێ نەفسی، سەرکەشی نەکات و ئاگاداری خۆی بێت، بۆ ئەو دنیا و ئاخیرەتی.
لە ئەو شێعرە دەڵێ :

* ئەهای نەفس! لەگەڵ تۆمە بۆ ئەوەندە لە خۆبایی بووی مەگەر چـت کردووە؟ هەندێ رەنج و ئازارت دیووە، وا دەزانی لـە تـۆ خوداناسـتر لـە ئـەو دنیایەدا نیە؟ ئەهای! هۆشت بە خۆتەوە بێت و ئەو دنیات لە بـەر چـاو بێـت و ئاخیرەت بگرە نەزەر. (هوشیاری جڵەو بە).

* * *

**(٤٠٠) «نالی»، ئێستە تاجی شاهی و تەختی خاقانیی هەیە**
**شەوکەت ئارا، موحتەشەم دیوانە، فیکرەت صائیبە**

**شەوکەت ئارا :** رازێنەری شـان و شـکۆ، «شـەوکەتی شـیرازی» شـاعیرێکی

گەورەی فارسە.

**موحتەشەم :** خاوەنی شان و شکۆ، جەلال و گەورەیی، نێوی دوو شاعیری گەورەی فارسە :

١ – «موحتەشەمی کاشانی» کە زیاتر مەدحی ئال و بەیتی کردووە و نەوحە و تازیەتی هۆنیوەتەوە.

٢ – «میرزا موحتەشەمی قائینی خوراسانی» کوڕی «میرزا هادی».

**فیکرەت :** بیر و را، نێوی شاعیرێکی فارس بووە، «فیکرەتی لاریجانی» کە «شەیخوڵئیسلامی لاریجانی بووە».

**صائیب :** ڕاست و دروستگە هێنەر (لە ریشەی گەیاندن). نێوی شاعیرێکە، «سائیبی تەبریزی» کە بە «شەمسوڵدینی تەبریزی» بە ناو بانگ بۆوە.

مەعنای ئەو شێعرە بە دوو جۆر دەکرێتەوە :

هەروا کە لە سەرەوە باسمان کرد و شاعیرەکانمان ناساند، «نالی» دەڵێ :

* ١ – ئەمن کەم کەسێك نیم. پایەبەرزم. ئەگەر لە ئەو گەورە شاعیرانە، وەکوو شەوکەت و موحتەشەم و فیکرەت و صائیب، بانتر نەبم خوارتر و کەمتر نیم.

* ٢ – کە ئەسڵی مەعناکەیەتی، واتە شاعیرێکی گەورە و پایەبڵیندە لە مەیدانی شێعر و ئەدەبدا. تاجی پاشایەتی و تەختی سەڵتەنەتی خاقانی هەیە و رازاوەتەوە بە شان و شکۆ و گەورەیی. خاوەنی دیوانە. خاوەنی شان و جەلالە.خاوەنی دەم و دەزگایە و بەبیر و رای بەهێز، ئەسپی شەرەفی لە گەردوون، جەولان و رم بازی دەکات.

* * *

**(٤٠٩) کە دیتم شەکڵی صەد رەنگی، گوتم: بابایی عەییارە**

**کە بیستم لەفظی بێدەنگی، گوتم: شەیپووی شاپوورە**

**بابای عەییار :** هەروا کە لە ئەفسانەدا ئەگێڕنەوە،کابرایەك بووە کە توانیویە خۆی بەهەر شکڵێك کە پێویستی ببوایە دەربهێنێ.
نووسەری ئەو شێعرانە چونکوو مەعنای شەیپووی نەزانیوە پیتی «ر»یی بۆ دانەوە و کردوویە بە شەیپوور.
**شەیپووی، شەیبووی، شەکپووی، شەلپووی :** دەنگی پێی کەسێك کە بە شەودا زۆر بێدەنگ و هێواش بە رێدا بچێ، پێ هەڵگردنی هێواش و پسکەپسك.
**شاپوور :** شاپووری ذوالاکتاف، یەکێ لە زنجیرەشاکانی ساسانی ئێران. لە سك دایکی دا، هۆرموزی بابی مرد. وەزیری گەورە، تاجی شاهی نا سەر دایکی و کردی بە شا. کاتێ خەڵك زانیان هۆرموز مردووە، دوژمنەکان بە تایبەت عەرەبەکان هێرشیان بردە سەر ئێران و دەستیان کرد بە غارەت و کوشت و کوشتار. ئەو غارەت و کوشت و کوشتارە، ئەو غارەت و چاپا و نائەمنییە درێژەی بوو. تاکوو شاپوور گەیشتە تەمەنی چاردە ساڵ و بە دەسەڵاتیەوە دەستی کردە حوکمرانی و ئەمنکردنەوەی وڵات. عەرەبەکان وازیان لە بشێوە نەهێنا. شاپوور رقی هەستا و فەرمانی دا بە هیچ جۆرێ بە عەرەب رۆحم نەکەن و کەس بەزەیی بە حاڵیانا نەیێت. عەرەبەکان کە ئەو کوشتارە بێرۆحمانەیان بینی، ناچار پەنایان بردە ئیمپیراتووری رۆم. ئەویش لەشکرێ گەورەی لە عەرەبی و رۆمی ساز کردوو هێرشی بردە سەر ئێران. شاپوور کە ئەوەیە زانی بەجل و بەرگی گۆڕدراو رۆیشتە نێو لەشکەری رۆم بۆ جاسووسی. کە پێیان زانی و گرتیان و خستیانە نێو چەرمی گاوە و لەگەڵ خۆیان، دەیان برد بۆ هەر جێگایەك کە هێرشیان دەبرد. بە دوای داگیر کردنی پاتەختی شاپوور، ئێرانیەکان کە لەو کارەساتە ئاگادار بوون، بۆ نەرم بوونەوەی پێستی گاکە، رۆنیان تێئەکرد. تاکوو شاپوور شەوێك خۆی دەرباز کرد و زۆر بە ئەسپایی خۆی رزگار کرد. بە ئەو هێواش رۆیشتنە، دەڵێن «شەیپووی». بە تایبەت «شەیپووی شاپوور»،

ناوبانگی دەرکرد.(فەرهەنگی دێهخودا، بەرگــی ٣٠ ، لاپــەڕەی ٢٦ ، ٢٧ ، ٢٨ ، ٢٩ ئیشارەتی بە ئەو ڕووداوە کردووە.)
بەو بۆچوونە مەعنای شێعرە کە ئەبێتە :
* کە چاوم بە شکڵی سەد ڕەنگی کەوت، گوتم : ئەوە بابای عەییارە کە خۆی بە هەر ڕەنگێك دەردێنێ. هەروا کە دەنگە کپەکەیەم بیســـت، گـــوتم: ئـەوە شەبیووی شاپوورە کە لێوی دەجوێ و دەنگی نایێ.
* * *
**(٤٠٩) گوتم: ڕاستی صەبا هەڵسە! گوتی: مەشرەب موخالیفیە**
**گوتم: ناری، گوتی: بایە، گوتم: ئەوجی،گوتی: دوورە**
**ڕاستی :** دروستی بێ پێچ و پلووچ، نێوی دەزگـــای مۆســـیقایە(راســـت پنجگـــاە، راست ساز، راست کـــوك)، نێـــوی شـــاعیری گـــەورەی فارســـە «ئـــەمیر ڕاستی تەورێزی».
**صەبا :** سروەی بۆن خۆشی دەمەو بەیانانی بەهار کە ئەویندارران نهێـــنی و ڕازی دڵی خۆیانی بۆ دەکەن، ئاهەنگ و مەقامێکە لـــە مۆســـیقادا، شـــاعیری گـــەورەی هاوچەرخی زەند و قاجار. (فتحعلی خان صبا، ملك‌الشعرای دربار قاجار).
**مەشرەب :** زەوق و سەلیقە، پەسەندی دڵ، شاعیری هاوچـــەرخی «نادرشـــای ئەفشار».کە نێوی «میرزا ئەشرەفی عامیری» بووە.
**موخالیف :** بەرپەرچ، ئاهەنگ و مەقامێکە لە زۆربەی دەزگاکانی مۆسیقادا.
**نار :** ئاگر، ئاور، ئازەر و ئاتەش، پەری، نوور، دوو ئاهەنگە (آذرگـــون و آتـــش افروز).
**با :** بزووتنەوە و توندی هەوا ، نێوی ئاهەنگێکە، (اوج، اوج و حضیض).
**دوور :** دژی نزیك نێوی سێ هەواو ئاهەنگی مۆسیقایە،(دور، دور شاهی).
«نالی» لە ئەو شێعرەدا، لەگەڵ یارەکەی وت‌وویژ دەکا بە جۆرێ کە بەر پەرچـــی یەکتر دەبن. مەبەستی «نالی» ئەوە بـــووە کـــە بســـەلمێنێ موتاڵـــای زۆری بـــووە و

ئاگای لە شاعێران و دەسگای مۆسیقاکان بووە. بەڵام بە هەر جۆرێـك بێ، ئـەبێ مانای شێعرەکە بدەینەوە. ئەتوانین بە دوو جۆر مانای بکەین :

* ١ – گوتم: کاکی راستی بە صەبای شاعیر بڵێ هەڵسێ. گوتی: ئاخـیر مەشرەب موخالیفی ئەم کارەیە. گوتم: ئەتۆ ئاگری. گوتی: با دەیکوژێنێتەوە یـان باکە بە ئاگرە کە گەشە دەکات. گوتم: ئەتۆ پەریت؟ گـوتی: بایـە. واتـە درۆیـە. گوتم: زۆر بەرزی، بە قەد ئاسمان بەرزەفڕی. گوتی: ئاسمان زۆر دوورە، ئەوە مـن دەگەڵ تۆ وت‌وویژ دەکەم و لە کنت دام.

*٢ – گوتم: هەوایێ راستیم بۆ بڵێ. دە هەستە، درەنگە! گوتی: نا شەوق و ئیشتیای من لەسەر ئاهەنگی موخالیفە. گوتم: نـاری بڵـێ. گـوتی: نـا، بـادی نەورۆزی هەوایەکی خۆشترە. گوتم: دەی باشە لەگەڵ ئەوجی دا چۆنی؟ گـوتی: نا، هەوای دوورم پێ‌خۆشترە.

هەروا کە لە پێشدا گوتم، مەبەستی «نالی»، وشە ئارایی و دەرخستنی تەرکیبات و کینایات و تەشبیهاتە.

* * *

**(٤١٢) نەونیهالی قەدی تۆ، عەرعەرە، دڵخواهی منە**

**راستە دڵدارە، وەلێ حەیفە کە وا بێ‌ثـەمـەرە**

**نەونیهال :** نەونەمام.

**دڵخواە :** ویست و ئارەزوو، حەز.

**دڵدار :** دڵدار و دڵبەند و دڵبەر، بە یار و مەعشووق دەڵێن:

**«کە یارا دلبرا دلـدار دلـبند**

**توئی بر نیکوان شاه و خردمند»**

واتە : ئەی یار! ئەی دولبەر! ئەی دڵـدار! ئـەی دڵبنـەند! ئـەتۆ بەسـەر جوانان و باشەکاندا، شاە و خاوەنی دەسەڵاتی.

* واتـە : ویسـت و ئـارەزووی مـن، باڵابـەرزە وەکـوو عەرعـەرە نەونەمامەکـەی تۆیـە. بـەڵام یـارە جوانەکـەم سـەد مـەخابن! کـە ئـەو

نەونەمامە وەکوو داری عەرعەر بێسەمەرە. ئەمەش سوودێکی بۆ دڵدارانی نیـــە. جگە لە خەم و خەفەت نەبێ.

* * *

**(٤١٢) قامەتی سەروی ئەگەر بێبەرە، بۆچ نارووەنە؟**
**تۆ بڵێ، زوڵفی ئەگەر دووکەڵە، بۆچ ناری بەرە؟**

**نارەوەن :** نەرم و ساف وسـوڵ، تـەڕوتازە، لقـی بـەرز و بڵیندی دار کـە بـا بیشەکێنێتەوە، (لێرە ناروەن دروستترە تا نارەوەن).

**ناروەن :** دارێکە پربەرگ و پر سێبەر و دایمە جوان لە هاوین و زستاندا. دارێکە لە رادەبەدەر رێكوپێك و بەرز، کە قەد و باڵای نازدارانی پێ دەشوبهێندرێ.

**«آنچنان راستی کە قد تو را**
**بدعا شاخ نارون خواهد»**

واتە : ئەوەندە رێك و پێکی کە ناروەن بە ئاواتە وەکوو تۆ بێ. گوڵنـاری پارسی بەشێك لەهەنارە.گوڵەکەی سەد پەڕەی هەیـە و لـە رادەبـەدەر سـوور و جوانە وەکوو گوڵباخی، داری هەنار. مەبەستی «نالی» لێرە گوڵناری پارسییە.

* واتە : باڵابەرز و رێكوپێکە وەکوو سەروەکەی، ئەگـەر وەکـوو داری سەرو، بێبەر و بێمێوەیە، لەبەر چی وەکوو ناروەن ئەو گوڵە جوانانەی پێوەیـــە؟ ئەوە لە لایەکەوە. لە لایەکیترەوە، پێم بڵێ ئەگەر زوڵفەرەشەکەی لـــە رەشـی دا وەکوو دووکەڵە، تا ئێستا دیوتە داری رەش بەری هەناری هەبێت؟ (مەبەست لـە مەمکەکانی یارە، کە زوڵفی شۆڕ بووەتەوە بە سەریاندا).

* * *

**(٤٢٠) بێتووکی جیفە خوارییو گەرگین و بێوجوود**
**لەم ئاو و خاکە، ظاهیر و باطن موکەددەرە.**

**گەرگین :** گورگین ناوە بۆ پیاو کە هەڵە بـووە،گـەرگـین بـە مـەعنای گـەڕۆڵ دروستە، بێوجوود، بێبایەخ و خوار و ناچیز.

**موکەددەر :** لێل و تاریك.

* واتە : «نالی» لە ناو ئەو وڵاتە کە دەشت و دەر و ناوی وەك یەك لێڵ و تاریکە و خۆی سووك و بێبایەخ و گەڕۆڵ بووە، بە سووکی ماوەتەوە. باشتر ئەوەیە کە لێرە نەمێنێ.

* * *

**(٤٤٣) ئەکثەر کەسینە، تابیعی بەردو حەرارەتن**

**یەعنی وەقوودی نارە بۆ خاری موسەییەرە**

چون «ئەکثەر کەسینە» جەمعە، حەرارەتە هەڵەیە. حەرارەتن دروستە.

**وەقوود :** سووتەمەنی، داگرساندنی ئاگر.

**موسەییەر :** جلی خەتخەتی، جۆرە هەڵوایەکە، سەیرانگای رێبوار، جێگەی بە ناوبانگ و دڵرفێن بۆ تەماشا کردن.

لە شێعری پێشوودا، ئەهلی ئەو دنیا بوون بە دوو فیرقە. کە لەم شێعرە بەشە گەورەکەیان جەحانمی و دۆزەخین و سزاواری زەمهەریر و ئاگر. کاتێ کە ئاگریان تێبەربوو، بوخاریان لێ هەستا. بۆقەکەیان تەماشاییە و جێگەی سەیران و سەرسوورمانە!

* * *

**(٤٤٩) ئەلا ئەی ئاسکی ناسک، بە باسک**

**شکاندت گەردنی صەد شێری شەرزە!**

**شەرزە :** شێری زۆر زۆردار و دڕندە و ددان تیژ.

* واتە : ئەی ئەوکەسەی ناسك و نازاری، وەکوو ئاسك جوان و شیرینی. ئەتۆ بە باسکە جوان و نازارەکەت ملی سەدها شێری دڕندەی ددان تیژت شکاندووە. کە لێرە مەبەست لە شێری شەرزە، جوانەکانی درواسێن. کە گرفتاری دەردی ئەوینی تۆ بوون و خەفەتی پێنەگەیشتنی بە تۆ کوشتوویانی.

* * *

**(٤٥٥) دەفەرمووی چاوەکەت زەنجیر کە «نالی»**
**کە موطلەق، چا نییە ئینسانی هەرزە**

**موطلەق :** بێچوون و چرا، بەراستی.

* واتە : ئازیزەکەم! ئەفەرمووی کە من چاوحیزم و چاو ببەستم و تەماشا نەکەم. چونکوو بە حەقیقەت، هەرزەیی باش نیە. جا ئەو هەرزەیی‌یە چ گلێنەی چاو بیکا چ ئینسان.

* * *

**(٤٥٦) نەوای ئاهەنگی «قەد قامت» طەریقی جەمعی زوهھادە**
**قەد و قامەت بە لەهجەی راستی طووبایی عوششاقە**

**نەوا :** ئاواز، ئاهەنگ، ئاوا، دەنگی خۆش.

**لەهجەی راستی :** بە حەقیقەت، لە راستیدا، زاراوەی راستی. واتە فارسی(راستی شاعیرێکی فارسە).

* واتە : دەنگی خۆشی «قد قامة الصلاة» کە رێگە و رەوشتی زاهیدەکانە، زۆر خۆش و دڵ هەژێنە. باڵای رێك و پێك «قەد و قامەت» بە زاراوەی فارسی، بۆ عاشقان ودڵدادەکان و دڵدارەکان، داری «طوبا»یە. ئەو دارە بەنرخ و جوانەیە کە دڵداران لە بەهەشتدا لە سایەی دادەنیشن و خۆشن.

* * *

**(٤٥٧) بە زوڵفی تۆیە وابەستە، لە من گەر دڵ پەرێشانە**
**بە ئەبرۆی تۆیە پەیوەستە، ئەگەر طاقەت لە من طاقە**

**وا بەستە :** پەیوەند دراو.

**پەیوەستە :** بەستراو، هەمیشە.

**طاقەت طاق بوون :** بێقەراری، دەزانین زوڵف دائیمە شۆڕ و پەرێشانە و ئەبرۆیش دائیمە خوار و ژوور دەکات و تا ئەوکاتە کە چاو بروانێ، برۆ حەرەکەت دەکات و بێقەرارە.

«نالی» دەڵێ :

* ئەگەر دەبینی کە گێج و ورم و دڵپەرێشانم، سەبەب ئەوەیە کە دڵم پەیوەندی لەگەڵ زوڵفە پەرێشانەکەی تۆی هەیە. ئەگەریش دەبینی کە بێقەرار و بێتاقەتم، هۆی ئەوەیە کە بەستراوم بە بڕۆکانتەوە و بۆیە بێقەرارم.

* * *

**(٤٥٨) دڵم بەردە ئەگەر شاخە، بە چاوی سووکی مەنواڕێ**
**بە خوڕایی نەسووتاوە، ئەمەیشەش کێوی طوورێکە.**

**دڵم بەردە :** دەس لە دڵم مەدە، لێمگەڕێ.
**شاخ :** کێو، لقی دار، کیسەی باررووتی شکارچی.
«نالی» خیتابی لە یارەکەیە و دەڵێ :

* دەس لە دڵم مەدە. هەرچەند بە دڵرەقم دەزانی و بە چاوی سووکی تەماشای دەکەی. دڵ سووتاوم. بەڵام ئەو سووتانە بە بۆنەی خودا پەرستی‌یە. یان گڕی ئاگری ئەوین سووتاندوویەتی. یان وەکوو ئەو کیسە باررووتەیە کە بە چەخماخەیەك ئاگر دەگرێ و دەتەقێتەوە. وازم لێ بێنە و دڵم مەتۆقێنە. خودای تەعالا هەروا کە لە کێوی تووردا، نووری خۆی ئاشکرا کرد، لە دڵی منیش‌دا هەیە.

* * *

**(٤٦٤) شاهێنی دو چاوت کە نیگاو مەیلی بە دانگە**
**کێشانی بە قوللابی دڵاوێزی بژانگە**

**شاهێن :** باز، مەلی ڕاو، میلەیەکە لە ناو ڕاستی تەرازوو، بەتایبەت تەرازووی میزان کە دایە مەیلە و تای قورس و سەنگینەکەیە و لە تا سووکەکەی دوور دەکەوێتەوە.
**دانگ :** بەشێکە لە شەش بەشی هەر شتێك، بە مەعنای پارە و دارویش هاتووە، کە مەبەستی «نالی» لێرە پارەیە.

* واتە : ئازیزەکەم! وا دیارە شاهێنی دوو چاوت، واتە مەیلت بە لای دەوڵەمەندەوەیە. من پارەم نیە. مەگەر بە گریان بتکێشمە لای خۆمەوە.

* * *

**(٤٦٤) صوٚفی و سەر و مێزەر، من و زوڵف و سەر و دەسماڵ**

**من کوشتەیی لاجانگم و ئەو کوشتەیی جانگە**

**جانگ :** پێشەی‌سەر، بانی مەڵاشوٚ لـە سـەرەو، کـەناری دەم و چـاو، کـرواس، (کرباس)، جاوتەنراوەی جوٚڵا لە دەزوەلوٚکە.

* واتە : سوٚفی بە سەرو مێزەرەکەیەوە، هەر چاوی ها بە شوێن کـراوس و جاو، بوٚ مێزەر دروست کردن. ئەمنیش بەســەر و دەسماڵـەوە ئاواتـە خـوازی لاجانگم. واتە بە ئارەزووی روٚخساری هەرە جوان و شـیرینم. بـە پێچەوانـەی سوٚفی.

* * *

**(٤٦٥) بنوێنە بروٚ، یەعنی هیلالی سەری مانگە**

**چوٚن وەعدەیی ماچی سەری کولمت، سەری مانگە**

* واتە : ئەی یار گفتت دامیٚ کە سەری مـانگ، لـە سـەر ئـەو کولمـە جوانەت ماچێکم پیٚ‌ئەدەی. ئەمن توانا و تەحەمولی ئەوەم نیە کە بتـوانم تـاکوو سەری مانگ، خوٚ راگرم. بوٚ ئەوەی کە بە وەعدەکەت وەفات کردبێت و ئەمنیش بە ئاواتەکەم،کە ماچ کردنی ســەری کولمــە جوانەکـەی توٚیـە گەیشت‌بم، بـروٚ نازارەکەت کە وەکوو هیلالی مانگی یەکشەوەیە وەدەرخە، با بڵێـن ئـەوە مـانگ هەڵات.

* * *

**(٤٦٦) «نالی» مەکە توٚرابوو لەبەر جەبهەیی گرژت**

**نایێتە ئەلات عیجزی لەبەر دووکەڵی قانگە**

**مەکە :** وازبێنە، بیٚ‌دەنگ بە، دەس‌راگرە، دەس هەڵگرە، توٚمەز، بڵی ئاوابی.

**قانگە :** سەبیلی دەسکە درێژ، چوپوٚق.

* واتە : «نالی» بڵی ئەو توٚریانەی یار لەبەر ئەوە بووە کە توٚ ناوچاوت داوە بە یەکا و رووت گرژ کردووە. یان نە، ئەو سەبیلە دەسکە درێژەی کە ها بـە

دەستەوە و هەر دووکەڵی لێ دەرئەخەی، هۆی عاجزی و تۆریانی یارە.

* * *

**(٤٦٩) دنیا مەحەللی کەون و فەسادێکە حیز و دوون**
**مەعلوومە چەن بە حیلەیە، عەییارە، چەن دەڵە!**

**مەحەل :** شوێن.

**کەون :** بوون هەستی.

**فەساد :** خراپە، و خراپ بوون و تێداچوون.

**دوون :** پەست و بێبایەخ.

**عەییار :** زۆرزان و فێڵباز.

**دەڵە :** سکن و تێرنەخۆر، خوێڕی.

* واتە : دنیا جێگەی فەسادە. زۆر بێبایەخ و زۆر فێڵباز و دەڵەیە. جگە لە خراپە و خوێڕیگەری هیچ شتێك، تێدا بەقای نیە. هەروا کە هاتوون، هەر واش دەڕۆن. مەبەستی ئەوەیە نێوی چاکە بۆ ئینسان بمێنێ باشترە.

* * *

**(٤٧٠) شکەنجی عەرض و طوولی پێچی زوڵفت بێسەرەنجامە**
**مەثەل طوولی ئەمەل، عومری خضر، زنجیری سەودامە**

**شکەنج :** پێچ و لوولی زوڵف.

**سەودا :** عەشق. مامەڵە.

* واتە : پێچ و لوول و ئاڵۆزی زوڵفە جوانەکەت بە هەر بارێکا پانایی، یان درێژی، دوایی نایێت و ئاخرەکەی دیاری نادا، دەزانی وەکوو چیە؟ وەکوو درێژی ئارەزووە کە دوایی نایێت. یان عومری «خضرە» کە تا دنیا دنیایە، زیندووە. یان وەکوو ئەوینەکەی منە، کە تا ماوم ئەو عەشقە هەیە و وەکوو زنجیرێ لە ئەستۆم دایە.

* * *

**(٤٧٢) لە سایەی روویی تۆوە شامی خەڵقی طەڵعەتی صوبحە**
**لە شامی زوڵفی تۆوە صوبحی ئێمە ظوڵمەتی شامە**

**طەلعەت :** هەڵاتن.

**ظولمەت :** تاریکی.

* واتە : ئازیزەکەم! لە سایەی روخسارە جوانەکەی تۆیە، کە لە کاتی روونیشان داین بە خەڵك دڵیان رووناکی پەیدا دەکات و شەوی‌زەنگیان لێ دەبێتە رۆژی رووناك. زوڵفە جوان و هەرە رەشەکانی تۆش کاتێ دەکەوێتە رووی روخسارە جوانەکەتدا، رۆژی رووناکم لێ دەکاتە شەو و خەم وخەفەت دام دەگرێ. (لێرە مەبەست لە شامی خەڵك، ئیشارەتە بە خەم و خەفەت. «طەڵعەتی صوبح»، ئیشارەت و کینایەیە لە شادی دڵ و دەروون و خۆشی).

* * *

**(٤٧٣) لە ئاب و تابی ئەشک و ئاهی خۆمدا بووم بە بوریانی**
**لە باتی پوختەگی، سووتام و ئێستەش پێم دەڵێ خامە**

**ئاب و تاب :** جوانی و رێك‌و پێکی، شیددەت، سەختی، دژواری.

**بوریان :** کەباب بوون.

**پوختە :** کوڵاو، سەردەرچوو، گەیشوو، دژی خام و کاڵ.

* واتە : لە سەختی و شیددەتی فرمێسك رژاندن و ئاه هەڵکێشان، بووم بە کەباب. ئێستەش یارەکەم لە باتی ئەوە کە پێم بڵێ شارەزا بوویت و لە هەموو شتێك سەرت دەردەچێ و شایانی هاونشینی منیت، پێم‌دەڵێ تۆ هێشتا خام و کاڵ و نەگەیشتوو و ناشارەزایت!

* * *

**(٤٧٣) نیشانەی پوختەگی، بێ‌دەنگییە «نالی»! ئەگەر پوختەی**
**بە حوججەت طەی بکە نامە، بە حیددەت پەی بکە خامە**

**حوججەت :** دەلیل، بەڵگە، نیشاندەر، نیشانە.

**حیددەت :** توندی، تیژی و سەختی، غەزەب، توان.

**طی :** پێداچوون، نووسین، پێچانـەوە، تۆمـارکردن، دژی بڵـاوکردن، شـاردنەوە، ڕێگەوە چوون.
**پەی :** توانا و پیێداگرتن، بنەو پایە، تاشین و دادان.
* واتە : ئەگەر پوختە و سەردەرچـوو و سـەنگین و گـرانی، نیشـانەی زانایی و لێهاتوویی سەبر و تاقەتە. دان بگرە بـە خۆتـا. بـە دەلیـل و بەڵگـەوە پێشکەوە و قەڵەمەکەت تیژکە و تۆماری گەورەیی و مەهارەتی خـۆت بنوێنـە و بنووسە.

* * *

**(٤٧٤) سۆفی کە گران بارە، بیێمەغز و سەبوکبارە**
**صووف پۆشیێ غەمی بارە، ئەوباری لە کن پەشمە**

**گرانبار :** قورس، چاخ، کینایەیـە لـە ئـاوس و گونابـار، نارەحـەت، خـەمبار، کینایەیە لە کەسێك کە کار و پیشەی زۆری بە ئەستۆ بێت، رەنج و زەحمەت.
**سەبوکبار :** خۆش خەیاڵ، ئاسوودە، راحەت، مەجازەن بریتیە لە کەسێك ماڵ و سامانی دنیای سێ تەڵاقە دابێت، نادان، چونکوو لە گەڵ بیێمـەغزی هـاتووە لـە ئەو شێعرە سەبوکبار یەعنیێ نادان و گرانباریش، گوناباری‌یە، چونکوو ئەو وشکە سۆفیە خۆی دەزانیێ کە خەریکی فروفێڵە.
* واتە : سۆفی نەفامی گوناباریش، دەزانیێ کە سۆفی پۆشی‌یەکەی فـر و فێڵە و بۆ فریـودانی خـەڵکی خۆشبـاوەڕە. بۆیـە بووەتـە بـارێکی قـورس بـە سەرشانیەوە. ئەگینا قورسی بار لە کنی هیچە و پەشمە. هـەرچـەند قورسـتریش بێت لەبەری نانوێنیێ. ریابازی و دووروویی، نارەحەتی کردووە.

* * *

**(٤٧٥) دێوانە کە شەیدا بیێ، تووکی سەری سەودا بیێ**
**قەط هیچی لەسەر نابیێ، دەستاری لە کن پەشمە**

* واتە : شێت بێ و عاشق بێ و تووکی سەریشی رەش بێ، یەعنی بە تەمەن جەوان و لاو بێ، ئیتر پیاوی وا چی لەسەرە. جەوانی و شێتی و عاشقی کە دەسیان دا دەس‌یەکەوە، کەس چاریان ناکات. ئیتر پیاوی وا مێزەرەی بۆ چیە؟

* * *

**(٤٧٦) صووفی! چییە ئێشی تۆ؟ هەرکایە حەشیشی تۆ!**
**عاشق وەکوو ریشی تۆ، هەوساری لە کن پەشمە**

**حەشیش :** چەرس، بەنگ کە لە وشككراوەی گیای «شادانە» بە دەس دێ، گیایەکی بە نرخە لە نێو گیاکاندا، بێبایەخترین گیا، کایە. دەڵێ حەشیش لە کن تۆ بێبایەخە وەکوو کایە.

*واتە : سۆفی تۆ سەرت لە چی دەردەچێ و چ دەزانی؟ کا و حەشیش لە کن تۆ جیاوازیان نیە. عاشقیش ئەگەر هەوساری لە مل بخەن، وەکوو تۆ کە ریشت هەیە و بەلاتەوە گرینگ نیە، ئەویش ئەو هەوسارەی وەکوو ریشی تۆ، بەلاوە هیچ نیە.

* * *

**(٤٧٧) بایێ لە طەرەف قیبلەمەوە دێت و وەزانە**
**یا بۆیی هەناسەی دەمی غونچەی لە رەزانە؟!**

**رەز:** میو، مەیو.

* واتە : بایەك کە لە لای یارەکەمەوە دێ و زۆر بۆن خۆشە. چونکوو دەزانم کە ئەو بایە هەناسەی دەمە جوانە وەکوو خونچەکەی یارەکەمە، کە زۆر زۆر بۆنی خۆشە. یان بۆنی باخەرەزەکانە کە هەوەڵیانە و بۆنی خۆشیان هەیە.

* * *

**(٤٧٩) شێخم! وەرە دەر فەصلی بەهار و گوڵ و گەشتە**
**ئەییامی لە گەرمابە خزان وەقتی خەزانە!**

شاعێر ئەگەر تەشبیهاتێکی ئاوا بەکار دێنێ، مەبەستی ئەوە نیە کە بڵێ گەرماوە

ڕۆیشتن، تەنیا لە پاییزدا چاکە و ئیتر سێ وەرزەکەی دیکە وەختی گەرماوە ڕۆیشتن نیە. دەبێ بزانین مەبەستی چیە.
**فەصلی بەهار:** دەورانی جەوانی.
**گەرمابە خزان :** پیری.
**وەقتی خەزان :** دەورانی پیری.
ڕووی قسەی «نالی» بە خۆیە و دەڵێ:
* شێخم، مەبەستی ئەوەیە وەرزی جوانی و وەرزی خۆش ڕابواردن و گەشت و گوزارە و کاتی چەشتنی خۆشی‌یەکان و لەززەتەکانی دنیایە. نەك بخزێتەماڵەوە و دەرنەکەوی. وەرزی لە ماڵ دانیشتن و دەرنەکەوتن، وەرزی پیریە و بێ‌دەسەڵاتی و هیچ لێ نەهاتوویی، کە چی تۆ جەوانی.
* * *
**(٤٧٩) ئەو شێخە بەکەم مەگرە کە پەشمینە مەریدە**
**ئەو ریشە بەسەر دارەوە ریسێکی بزانە**
**مەرید :** نافەرمان، یاخی، گونابار شەڕاوی شەیتان، خورمایەکە بخرێتە شیرەوە.
**ریس :** شووربا، هەریسە، غەزەب، زۆر و قووە، زەبەردەستی، وەزەی ناو گوێ، گورێس، تاڵ، سووك کراوەی بە لەنجە ڕۆیشتن.
* واتە : ئەو شێخە ریابازە بە کەم مەگرە و بە باشی مەزانە. چاوت لە پەشمینە پۆشیەکەی نەبێ. شەیتانێکە بۆ خۆی. ئەو ریشەش کە هێشتوویەتەوە و بەو بۆنەوە فریوت دەدا، نموونەی زەبەر دەستی‌یەکەیەتی. هۆشت بە خۆتەوە بێ.
* * *

**(٤٨١) حوسنی نەظەرە ئەصلی نەظەر حوسنی بە عیصمەت**
**صوفی کە دەکا تەرکی، بە ئینسانی مەزانە**
لە شەرحی شیعری «٤٧٩»دا گوتم : لێکۆڵینەوەی شێعر تەنیا ڕواڵەتی شیعرەکە نیە. بەڵکوو دەبێ مەبەستی شاعێر بدۆزینەوە و لێرە تەنیا ئەوە نیە کە :

حوسن یەعنی جوانی، *نەظەر* یەعنی تماشا، و *ئەصڵ* یەعنی بنەڕەت و...
ئەوەم لە پێشەکی دا عەرز کردووە کە زەحمەتی ماموستا و کورەزاناکانی سوپاس و رێز و ئیحترامی دەوێ. جا ئەگەر نەختێ لە هەندێ شێعر دا دەکوڵێمەوە مەبەست رۆشن بوونەوەیە. نە خۆنموویی یان خودای نەخاستە ئیدیعای ئەوە کە لە ناو براوان، وریاترم! نا نا، ئەوان گەورە و هێژا و شایاینی رێزن!
با بچینە سەر شێعرەکە. سوفی ئەگەر ریاباز نەبێ، دەیەوێ تەریقەی «تصوف» کە بە دوای زەحمەتی زۆرەوە بە دەس دێ و لە ئەنجام دا بە «فنا فی‌نفسە» و «فنا فی‌شیخە» و «فنا فی‌الله» بێت و بە «لقاالله» بگات. کەوابوو تەماشای جوانیەکان بە پاکدامەنیەوە نە تەنها گوناح و خراپ نیە، بەڵکوو باشترە. (فخرالدین عراقی/ همدانی، بە بۆنەی کوڕە قەڵەندەرێك گەیشتە شیخ الشیوخی میصر).
نالی دەڵێ :
* ئەو سوفیە کە تەماشای رۆخساری جوان ناکات، ئەوە درۆزنە و ریابازە. ئەتۆش بە ئینسانی مەزانە.

* * *

**(۴۸۱) ئەو گەوهەرە نوکتە کە لە «نالی» دەدزن خەڵق**
**ئاوی نییە، وەک ئاگری بێ‌شەوقی دزانە**

* واتە : ئەو نوکتەیە کە وەکوو دوڕ بێ‌مانەندە و خەڵکی لە منی دەدزن و ئاوێتەی شێعرەکانی خۆیانی دەکەن. ئەو دزانەی ئەدەبیاتە هێشتاکوو نەزانیوە کە ئاو و ئاگر دژی یەکن. نوکتەکانی من و شێعرە ساکارەکانی ئەوان پێکەوە ناگونجن.
مەبەستی «نالی» لێرە لە هێنانی ئاو و ئاگر و چرای دزیەتی و بێ‌شەوقی، هەمووی ئەوەیە کە دزی زوو دەردەکەوێ و ئەو دزانە دەس هەڵگری ئەو کارە ناشیرین و نالەبارە بن.

* * *

**(٤٨٦) وتم: داخۆ چیە سوور و سپی تێکەڵ؟! کە تێفکریم**
**سەراسەر کەلەیی ئوشتر لە بالەب خوێنی ئینسانە**

* مەبەستی «نالی» لێرە حەجحە و حاجیەکان.کە دایمە هان بە رێگـەوە. بە تایبەت حاجیە دەس‌کورت و بێ‌پاکان کە پیادە و پێ‌پەتی دەڕۆن بۆ زیـارەتی مەککە و بەجێ هێنانی وا جیباتی دینی. خوێنی ئینسان، خوێنی پێی پیادەکانە کـە لە ئەو رێگەدا قاچیان بریندار ئـەبێت و خوێنیـان لێ دێ. کەلـەی وشـترەکان و سپیەتی ئێسکەکانی ئەو وشترانەی مەبەستە کە دەوڵەمەندەکان سەریان بڕیـوە بـۆ خواردەمەنی.

* * *

**(٤٩٥) شەفیری چاڵی شۆری هەر دەڵێی لەعلی نمەک‌پاشە**
**حەفیری چاهی وشکی هەر دەڵێی چاهی زەنەخدانە**

**شەفیر :** کنارەی پێڵووی چاو، کنارەی لێوی وشتر، لێو حەوز و لێو چاڵاو.
**حەفیر :** قەبر، قەبری کەندراو و پڕنەکراو، چـاڵ، رۆخانەیەکـە لـە ئـوردون دا، هەوەڵین مەنزڵی حاجیەکان لە بەسرەوە بۆ مەککە، چاڵاو.
هەروا کە دەزانین نـالی هـەر شـتێکی زۆر خوشویسـت بێ، تەشـبیهی دەکاتـە یارەکەی.

* واتە : کنارە و لێوی چاڵەکان وەکوو لێوە سوورە جوانـە نمەکینەکـەی یارە و چاڵی و چوڵەکانیشـی هـەر دەڵـێ چـاهی زەنـەخدانی یارەکەمـە.(ئـەو تەشبیهاتە عەشقی «نالی» بە زیارەتی مەککە دەسەلمێنێ).

* * *

**(٤٩٥) لە باتیی لالەیی حەمرا جگەر پوڕ داغی خورشیدە**
**لە باتی سونبولی تاتا، سەر و سەودا پەرێشانە**

**مەککە :** مەککە و زیارەتی مەککە، شوبهێندراوە بە خۆر.
**سەر و سەودا پەرێشانە :** زیارەتی حەج بە جۆرێك شەیدای کردووم کە سەرو

سەودام لە بیر چووەتەوە.
«نالی» لە لایەکی دیکەوە لە کوردستانە، کە دەرودەشت و کێو و دۆڵی هەمووی پڕە لە لالە و سونبول و دار و درەختی رازاوە و جوان و جۆگە و جۆباری پڕئاوی وەکوو ئاوی حەوزی کەوسەرە. لەو لاشەوە لە بیابانی مەککە دایە. چۆڵ و هۆڵ و بێگیا و بێگوڵ و سەبزە. بەڵام عەشقی زیارەتی مەککە و پابۆسی پێغەمبەری مەزن، شێت و شیدای کردووە و دەڵێ :
* باشە ئەگەر گوڵاڵە سوورە نیە، جەرگم لە عەشقی مەککە، کەواوە و سوورە. ئەگەریش سونبولی تاتا دەس ناکەوێ و سەبزە ناکەوێتە بەرچاو، هەر ئەوەندە شێت و شەیدای زیارەتم کە عەشق و دڵداری لە بیرم نەماوە.

* * *

**(٤٩٥) موغەیلانی جل و مێزەر دڕینی صوفییە یەعنی**
**ئەمە ڕێی موحریمانی مەحرەمی سەر ڕووت و عوریانە**

* واتە : سۆفی لێرا ئیحرامی بەستووە و سەری ڕووت کردووە و جگە لە لیباسی ئیحرام شتێکی پێنەماوە. وەکوو شتێك خارە موغەیلانەکەی ڕێگای مەککە مێزەرو جل و بەرگەکەی دری بێت.

* * *

**(٥٠٧) شەقاوەت بوو بە دوود و داخڵی کوورەی ضەلالەت بوو**
**ئیمارەت خوسری خوسرەو، کەسری کەسرا شەقی ئەیوانە**

**شەقاوەت :** بەدبەختی، شەرارەت، خاری، نیکبەت، پەرێشانی، کینە و دوژمنی.
**ضەلالەت :** گومڕایی.
**خوسر :** زەرەر و زیان.
**کەسر :** شکیان.
**کەسرا :** لەقەبی شاکانی ساسانی.
**شەق :** تێدا هەڵدان، درز.

لێرە هەڵەی نووسیار بووە. بەڵام مامۆستا باشی مەعنی کردووە. واتە نیشانە. شەرح و لێکدانەوەکەی لاپەڕەی «٣٣»، ئەگینا ئەمارە مانای حاکمی و پاشایەتی‌یە.

* واتە : بە دوای بیعسەت و پێغەمبەری حەزرەتی موحەممەد ـ دروود و سڵاوی خودای لە سەر بێ ـ بەدبەختی و چارەڕەشی لە دنیای ئیسلامدا نەماو بوو بە دووکەڵ. بەڵام ئەو دووکەڵە ئاوێنەی کوورەی گومڕا بوون لە دینی ئیسلام لایان داو نیشانەکەشی زەرەر و زیانی خەسرەوی پەرویز شاهەنشای ساسانی‌یە. کە بە دەستی کوڕەکەی خۆی کوژرا و تاقی کەسراش کە مایەی شانازی شاکانی ساسانی بوو، شەقی برد و درزی تێکەوت و لە ئاخردا کەوتە دەس موسوڵمانەکان.

* * *

**(٥٢٠) سوروشکی من کە لێڵاوە، غوباری کۆە و هاموونە**
**وەرە سەرچاوەکەم بڕوانە وەک ئاوێنە چەن روونە**

«نالی» لێرە لە مەتەڵێك کە لە فارسی‌دا هەیە کەڵکی وەرگرتووە. شایەد دەوربەرەکانی خراپەیان گوتبێ. فرمێسکی کردووە بەهانە و لەو مەتەڵە فارسیە، کە «آب از سرچشمه گل‌آلود است»، کەڵکی وەرگرتووە و دەڵێ :

* کاکە گیان، ئەگەر دەبینن لەگەڵ کەسانێك کە باش نین، هاوشانم و بەو بۆنەوە خراپەم دەڵێن، نا نا، وانیە، ئەگەر فرمێسکم لێڵاویە، واتە بە خراپەم دادەنێن، وەرنە سەرچاوەی دڵم کە چەندە پاکە. واتە جەوهەری زاتی من خراپ نیە. بەڵکوو پیاوی بە دین و بەئیمان و خەڵك خۆشەویست و دوور لە ریا و دووڕوویم. ئێستا بە بۆنەی ئەو هاونشینانە بە خراپم مەزانن.

* * *

**(٥٢١) مونەججیم کەرگەس و لاشەی لە لا شەیئێکە نەیزانی**
**کە ئەم ئەفلاکە چەند لاکە، کە ئەم گەردوونە چەند دوونە**

**ئەفلاک :** جەمعی فەلەك.

**لاک :** تەغار، لانجین، کاسەی چێوی، گوڵی سوور کە جل و بەرگی پێ ڕەنگ دەکەن، ئەو دەرمانە کە لاك و مۆری پێدەکرێ، دەرمانی سوور کردنی نینۆکی ژنان و کچان، زایع و خەراپ، زەبوون و کز و لاواز.

**دوون :** رژد، پەست، بێبایەخ، ژێر، نزیك بوون، شتی زۆرکەم، ناکەس.

«نالی» ئەو شێعرەی، لە داستانی قەلەرەشکەڵە و داڵەکەرخۆرەکەی گوڵیستانی سەعدی کە باسی قەزاو قەدەر دەکا، کەڵکی وەرگرتووە کە دەڵێ :

**‹چنین گفت پیش زغن کرکسی**
**که نبود زمن دوربین‌تر کسی**
**شنیدم که مقدار یکروزه راه**
**بکرد از بلندی به پستی نگاه**
**چنین گفت دیدم گرت باور است**
**که یک دانه گندم به هامون در است**
**زغن را نماند از تعجب شکیب**
**ز بالا نهادند سر در نشیب**
**چو کرکس بر دانه آمد فراز**
**گره شد بر او پایبندی دراز**
**ندانست از آن دانه‌ای که خوردنش**
**که دهر افکند دام بر گردنش**
**زغن گفت از آن دانه دیدن چه سود**
**چو بینایی دام خصمت نبود**
**شنیدم که می‌گفت گردن به بند**
**نباشد حذر با قدر سودمند›**

سەعدی دەڵێ : «رۆژێك داڵەکەرخۆرەیەك بە قەلەبازەڵەی گوت : دەزانی لە من چاوتیژتر لە دونیادا دەست ناکەوێ؟ ئینجا بە ئەندازەی رۆژەرێگایەك بە ئاسماندا روانی و گوتی: دەنکێ گەنم لە فڵانە شوێن، داکەووتوە. قەلەبازەڵە بە سەر سوورمانەوە گوتی: شتی وا نابێ. بڕۆین بزانین. ئینجا هاتنە

خوارێ. لە کن دەنکە گەغەکە نیشتنەوە. لە ناکاو داڵەکەرخۆر تووشی داوەکە بوو. قەلەکە گوتی : تۆ دەنکە گەغەکەت چاو پێکەوت. بەڵام داوەکەت نەدی. ئەوە چ سوودێکی هەیە؟ لە وڵامدا داڵەکەرخۆر گوتی: بەڵێ دروست ئەڵێی بەڵام ناتوانی لە قەزا و قەدەر خۆت بپارێزی».

«نالی» ئەستێرەگری بە کەرکەس شوبهاندوە و دەڵێ :

* ئەستێرەگری بێچارە وەکوو کەرکەسە، کە بە هیچ کولۆجێ ناتوانێ لە قەزاو قەدەری رەبیانی خۆی لابداو خۆی بپارێزێ. دەبێ بزانی کە ئەم دنیایە چەندە لاش و بۆگەندە و ئەم گەردوونە چەندە پەستە و چەرخی فەلەك سوورانەوەی چاکە و خراپەی هەیە. چارەنووس چی بێت هەر ئەوەیە. هاتووە دەڵێ کار و باری ئەستێرەکان ئاوا پیشان دەدەن و بارودۆخی جیهان بەم جۆرەیە. ئاوا بە رێگەوە دەچێ یان چلۆن دەگۆردرێت و هتد ...

نا، وانیە. قەزا و قەدەر کاری خۆی دەکا وئەتۆ ناتوانی دابینکەی کە ئاوا دەبێ یان وا نابێ.

* * *

**(٥٢٢) لە دەورانی طەبیعەتدا لەگەڵ ثەورى فەلەک جووتە**
**لە ملیا چەنبەری دەوران و طەوقی چەرخی گەردوونە**

**سەور (ثور):** گا، گای فەلەك، یەکێك لە شکڵەکانی «منطق‌البروج»ە. کە لە ئارای حەمەل/ جەوزا دایە، بەرە و رۆژهەڵاتە و پشت لە خۆرنشین و یەك‌سەدوچل‌ویەك(١٤١) ئەستیرەیان بەسەریا رەسەد کردووە. دەهەمین بورجە کە دوو خانە، دوومالْ، واتە دوو مەنزڵی هەیە. یەکێکی زوهرەیەو ماڵەکەی تری میزانە. زوهرەش دوو مەنزڵی هەیە. یەکێکی سەورە و ئەوی دیکەی میزانە. بە هەر بارێکا هەر پێکەوەن. واتە جووتن.

**زوهرە :** نێوی ئەو ئافرەتەیە کە هارووت و مارووت دوو فریشتەی ئاسمانی عاشقی بوون. زوهرە ئەستێرەی پرشنگ‌دار و زۆر زۆر سپی و رۆشنە و زۆر

نوورانیە و تەقریبەن بە ئەندازەی زەمینە. لە هەموو ئەستێرەیەك بە زەمینەوە نزیك‌ترە. کەمەیەك وەك ئاخڵەی مانگ، یان هەوری کەمەربەند ئاسایی دایە ها بە دەوریەوە، کە پێ دەڵێن چەنبەر یان ملوێنك. ئەستێرەشناسەکان پێیان وایە کە بەشێکی قەترەی ئاوە و بەشێکی‌تری ئیدروکەربۆنەکانە. یەك ساڵی زۆهرە حەوت مانگ و پانزدە رۆژی خۆمانە. واتە (۲۲۵)رۆژ. گەرمای زۆهرە (۴۲۶) دەرەجەیە. چ بە رۆژ چ بە شەو.(۴۲۶ درجەی سانتیگراد).
دەڵێن زوهرە و زەوی دوو خوشکی لفەدوانەن. بەشێ لە عاروەکانی عەراق و شام، زۆهرەیان پەرەستش کردووە. زوهرە بە بۆنەی ئەو کەمەربەندە کە هابە دەوریەوە و باسمان کرد، نابیندرێت. کاتێ کە نیزیکی عەرزە، نێوانی «۳۰» میلیون کیلوومەترە کە لە ئەو حاڵەتەدا بۆ کەس نابینرێت. بەڵام کە دوورکەوتەوە دەیبینن. لەم کاتەدا «۱۹۶» میلیون کیلوومەتر لە عەرزەوە دوورترە. دەبێ ئەو شێعرە بۆ پاشای بابان حاکمی سولەیمانی گوتبێت کە دایە پێکەوەن و لە یەك جیا نابنەوە. هەروا کە باسمان کرد سەور و زۆهرە دایە پێکەوە لە یەك خانە دان. سەوری فەلەك هاوجووتی ئەو شیرینە نازدارەیە کە هارووت و مارووتی گیرۆدەی خۆی کرد. ئەو هەموو نازداری‌یە بۆ شاری سولەیمانی و حاکمە پشتا و پشتەکانی ئەو شارە. واتە بابانەکان، شوبهێندراون بە ڤەوری فەلەك و شاریش بە زۆهرە.

* * *

**(۵۲۴) دڵ سیاسەنگ نەبێ، مایلی خاکی وەطەنە**
**خاڵی لەعلی حەبەشە، ساکینی بوردی یەمەنە**

دڵ ببێتە بەردی رەش و مەیل بە خاکی نیشتمانی، لەگەڵ خاڵی لێو و بوردی یەمەن تێفکرانی زۆری دەوێ.
ئەوەیەکە دەبێ بزانین و روونی بکەینەوە چۆن دڵ دەبێتە سیاسەنگ و هتد..
بە بڕوای من ئەم بەیتە وردبینی و وردەکاریەکی سەرنج راکێشی تێدایە و جگە لە

نیشتمان پەروەری، خەیاڵی ناسکی «نالی»مان بۆ دەردەخات.
**سیاسەنگی دڵ :** ئەگەر کەسێك زۆر دڵرەق بێت پێ‌دەڵێن: دڵبەرد. ئەگەریش متمانەی بە کەس نەبێت و بە چاوی شك و دوو دڵیەوە بۆ خەڵك بڕوانی، پێ‌دەڵێن: دڵڕەش. ئەو کینایانە بۆ نیوەی ئەوەڵی شێعرەکەیە. بەڵام نیوەی دووهەم خاڵی لەعلی حەبەشەیە. یەعنی ئەو خاڵە کە ها بە سەر لێوە جوان‌و سوورەکەی یارەوە، ساکینی بوردی یەمەن، یەعنی دانیشتووی بوردی یەمەن، یان داپۆشراو بە بوردی یەمەنی‌یە. دەزانین کە لێو هەم بە لەعل و هەم بە عەقیق شوبهێندراوە و عەقیقی یەمەنی بەناوبانگە.

* واتە : ئەگەر دڵ وەکوو بەردی ڕەش نەبێ، بە زێد و نیشتمانەکەی خۆی خزمەت دەکات. لە شەو ئەویش دەزانین، ئەگەر دڵ ڕەش ببێتەوە و لە کار کەوێ، لەش لە نێو دەچێ. ئەوەیە دایە دڵ ساکینی لەشە و لە ژێر سنگدایە و بەم جۆرە دەرکەوت، (دڵ و لەش لازم و مەلزوومی یەکن). هەروا کە خاڵە ڕەشەکەی سەر لێوی یار ـ کە مەبەستی دڵە ـ خۆی خستووەتە ژێر بوردی یەمانی، دەم هەڵپیچ و خۆی شاردۆتەوە ساکینی یەمەن ـ مەبەستی لەشە ـ بووە. جا ئەگەر دڵڕەش و ڕەق نەبێ، دەبێ نیشتمان خۆشەویست بێ.

* * *

**(٥٢٥) پەرچەمی سونبولی‌یو، قەددی «قەضیب البان»ی**
**زوڵف بە هلوولی‌یو، خەط زەنگی‌یو، وەجهی حەسەنە**

**پەرچەم :** زوڵف.
**قەد :** باڵا.
**قضیب :** شاخەی درەخت، (بۆ تاریفی باڵای ڕێك‌وپێك دەڵێن وەك شاخی شمشادە کە لێرە قضیب البانە).
**بان :** دارێکی ڕێك و خۆش‌بۆن.
**زوڵف بەهلوولی :** پرچی پەرێشان.

**خط زنگی :** سیاتاوە، ئەسمەر.
**وەجهە :** روو.
**حەسەن :** جوان.
«نالی» تاریفی یارەکەی دەکا و دەڵێ:
* زوڵفی وەکوو سونبول جوان و بە بۆنە. باڵای بەرز و رێك‌وپێکە هەر وەکوو شاخی داری بانە. ئەگریجەی پەرێشانە و رەش‌تاو و ئەسمەرە و رۆخساریشی زۆر جوانە.

* * *

## (٥٢٥) طەلعەتی ئایەتی جان، مەظهەری ئیعجازی بەیان
## لەبی دورج و، دەهەنی سیرر و کەلامی عەلەنە

**طەلعەت :** دەرکەوتن، روخسار، دیتن، هەڵاتنی خۆر و مانگ، دیدار و ..
**ئایەت :** نیشانە.
**مەظهەر :** جێگەی سەرکەوتن، جێگەی پەیدابوون، نیشاندەر.
**ئیعجاز :** عاجیز کردن، ناهومێدی و سەرسوورمان، کارێ کەس نەکردبێ جگە پێغەمبەران.
**بەیان :** دەرکەوتن، دەرخستن، قسە و گفتوگۆ کردن.
**دورج :** مجری، قوتووی بچووك، جێگەی زێرِوزیو.
**سیرر :** نهێنی.
**عەلەنی :** ئاشکرا.
* واتە : رۆخسارە جوانەکەی یار، نیشانەی رۆح تازەبوونەوەیە و مایەی ژیانە. هەر ئەوەندە جوان و بێهاوتایە کە نیشاندەری سەرسوورمانە، وەکوو موعجیزە وایە. لێوەکانیشی ئەوەندە جوانە کە دەڵێ مجری و سەندووقی

زێر و مرواریە و دوڕ مرواریەکانی ـ ددانەکانی ـ دەمی دائەپۆشێ.
بەڵام ئاشکرایە، مەبەستی «نالی» لە ئەو قسە و تەشبیهاتە دەربڕینی ئەوپەڕی جوانی یارەکەیە.

* * *

**(٥٢٦) وەک گوڵی ئاتەشی خەملیوە بە بەرگی چەمەنی**
**قامەتی نارەبەرە، نارەوەرە، نارەوەنە**

**گوڵی ئاتەشی :** گوڵێکی سووری زۆر جوانە کە مێرگ و چەمەن دەڕازێنێتەوە.
**نارەبەر :** داری هەنار، دارێکە کە بەری هەنارە.
**نارەوەر :** بە ژنێك دەڵێن کە مەمکەکانی وەکوو هەناری لێ هاتبێ.
**نارەوەن :** نەرم و ساف و تەڕوتازە و جوان و ڕێكوپێك.

* واتە : یارەکەم ئەوەندە جوان و شیرینە وەك گوڵی ئاتەشی وایە. چۆن ئەو گوڵە بەرگی چەمەن دەڕازێنێتەوە و جوانی دەکا، ئەویش بە جل بەرگی جوان ڕازاوەتەوە. چونکوو مەمکەکانی وەکوو هەناری لێهاتووە. باڵاشی بەری هەناری گرتووە. زور نەرم و نۆڵ و تەڕوتازە و جوان و ڕێكوپێکە و تازە پێگەیشتووە.

* * *

**(٥٢٧) رۆشنیی دیدە بە ئینسانە کە موژدەی قەدەمت**
**رۆشنیی دیدەیی غەمدیدەیی ‹بیت الحزن›ە**

«نالی» لێرەدا بە ئیشارە دەڵێ :

* بە خاتری دووری تۆ ئەوەندە گریام کە گلێنەی چاوم سپی بووە و کوێر بووم. موژدەی هاتنت وەکوو ئەو موژدەیە کە بۆ حەزرەتی یەعقووبی پێغەمبەر ـ دروودی خودای لە سەربێ ـ هات و بە هۆی ئەو موژدەیە، رووناکی کەوتە چاوەکانی ـ کە لە هیجرانی یوسوف لە «بیت الحزن»دا، کویر بوون و چاوە کوێرەکانی ساغ کردەووە، منیش هەروام. (نالی خۆی بە یەعقووب

و یارەکەی بە یوسوف شوبهاندوە).

* * *

**(٥٢٨) لە و وەختەوە بیستوومە دیتن بەقەدەر چاوە**
**هەر مووم لە بەدەن، یەکسەر، وەک عەینی فەنەر، چاوە**

*واتە : لەو کاتەوە کە بیستوومە دیتن بە ئەندازەی چاوە، چونکوو دەزانم ئازیزەکەم زۆر جوان و نازدارە، تەواوی لەشم، حەتتا مووەکانم بووەتە چاو بۆ دیتنی ئەو خۆشەویستە. ئەویش چلۆن چاوێ؟ چاوێ کە هەر وەك چاوی فەنەر دایە ئاوەڵایە.

* * *

**(٥٢٩) جێگایێ نەظەرگابێ، شەش جانبیی دەریا بێ**
**ئەی مەردومی سەیرانی لەم خیططەیە هەرچاوە**

**نەظەرگا :** ئەو شتە یا جێگایە کە تەماشای دەکەن، زیارەتگا.

مەبەست و ئامانج :

**از نظرگاه است ای مغز وجود**
**اختلاف مؤمن و گبر و یهود**
**«مولوی»**

واتە : ئیختیلاف و ناکۆکی ئارای موئمنین و گەبر و جوولەکە بە خاتری مەبەست و ئامانجەکەیانە.

چاو :

**گرد صافی چنانکه درد نماند**
**در نظرگاه دردمند فشاند**
**«نظامی»**

واتە : گەردێك و تۆزێك زۆر ساف و بێگەرد رژاندیە نێـو چـاوی کـە

ئێشی بوو. ئیتر ئێشەکەی نەما. (لێرە مەبەستی «نالی» جێگای تەماشا کردنە).

* واتە : خەڵکینە! سەیرانکەران! وەرن تەماشای ئەو ناوچەیە کەن. دەر و دەشتی هەر چاوە. چونکوو جێگای تەماشا کردنە. تەماشای نازاران و دیتنیان ئەگەر دەوراندەوریشی دریا بێ هێشتا تەماشاکەری زۆرە.

* * *

**(٥٢٩) چاویشی لە «نالی» کرد، دین و دڵ و جانی برد**
**گەر زوڵفە ئەگەر نازە، گەر خەندەیە، گەر چاوە**

**چاو لێکردن :** روانین، خۆ پیشان دان، ئیشارەکردن، چاوداگرتن.

* واتە : چاوێکی لێ کردم کە بە ئەو چاو لێکردنە، گیانەڵای کردم و دڵی رفاندم و لە هەمووی گرینگ‌تر ئەوەیە کە دینی لێ ئەستاندم.
جا نازانم ئەو بەدبەختیە بە بۆنەی زوڵفە رەشە هەرە جوانەکەی بوو، یان خەمزە و نازەکەی، یان ئەو پێکەنینە و چاوە جوانە مەستەکانیەتی.

* * *

**(٥٤٠) دامەنی پاکی مەداری دائیرەی خامەک نییە**
**خوێنی مەقتووڵانە وا دامێنی یاری گرتووە**

**مەداری دایـرە :** کەمـەی دەوری دایـرە، (پـیراموون و دەوری دایـرە کـە لـە ناوەندەوە بۆ هەموو نوختەیەك، یەك ئەندازەیە).دامێنی کراسی ژنان خڕە وەکـوو کەمە و مەداری دایرە وایە.

**خامەک :** قەنەوز ئەرخەوانی‌یە و وەنەوشەیی ئاماڵ سوورە و جارجار کە خـۆر لێبدات سوور دێتە بەرچاو و بە خەیاڵی بینەر سوورە.

* واتە : ئەو رەنگە سوورە کە لە داوێنە پاکەکەی یار دەبینـدرێ، مەڵێ دامێنی پاکە و ئەو رەنگە رەنگی قەنەوزە کە خۆر داویە لێ و لە دوورەوە سـوور دەکاتەوە و تایبەتمەندی خامەکەیە. نا نا، قەت وانیە. ئەوە خوێـنی دڵدارانیـەتی کە بە بۆنەی ئەوینی، داوێنی ئەو یارە دڵڕەقەی گرتووە و سـووری کردووتـەوە. کەوا بوو بزانە کە داوێنی یاریش پاك نیە.

* * *

**(٥٤٠) گەرد و بادی هێجری تۆ وا عالەمی لێ کردمە تۆز**
**نەک دو چاوم، بەڵکە حەتتا دڵ غوباری گرتووە**

**دڵ غوبارگرتن :** بێمەیل بوون دەگەڵ دۆست و یار و قەوم و خوێش، بۆ بێگانە ئەو وشەیە بەکار نابەن، تۆریان.

**دنیا تۆزگرتن :** بەر چاورەش بوون.

* واتە : ئازیزەکەم! دووری و دوورکەوتنەوە لە تۆ نەتەنیا دنیای رۆشنی لێ تاریك و بەرچاوی رەش کردووم، بەڵکوو دڵیشم لێت بێمەیل بووە و لێت تۆراوم. ئەگەر ئەو دووریە درێژەی بێت، ئیتر نە من و نە تۆ.

* * *

**(٥٤٥) قامەتت نەخلی بەشیری، فائیقەی پەی کردووە**
**نەحلی بێنێشی مەمەت، شەهدی سپی قەی کردووە**

بۆ لێکۆڵینەوەی نیوەی یەکەمی ئەو شێعرە، پێویستە بزانین کە نەخل چیەو چ تایبەتمەندیکی هەیە و بە چی دەشوبهێندرێ و نەحل چۆن بە شیر دەبێ. ئەوسا، مەعناکەی لێك دەدەینەوە.

**نەخل:** (درخت خرما شجره مبارك است و به آدمی نیك مانند است و به طول وراستی و قد و امتیاز ذکر و انقی و بوی طلع و... که به نطفه و شکل طلع (شکوفەی نخستن خرما)، که به مشیمه ماند و لیف که به موی آدمی ماند و آنکه ماده که نزدیك بود فحل بیش خواهد و آنکه به همدیگر عاشق شوند و این همه صفات انسانی است (نزهة القلوب)).

**بەشیر ( شیرا) :** ئەو ئافرەتە یان گیانلەبەرە کە مەمکی پڕ بێت لە شیر یان نەخلی مێوینە.

**فائیقە :** باشترین، هەڵبژێردراوترین و جوانترین لە هەر شتێك.

**پەی کردن :** قاچ بڕینەوە، کینایەیە لە سەرکەوتن بەسەر باس کراودا و لە

ڕەونەق خستنی باس کراوەکە.
**نەحل :** هەنگ.
**شەهدی سپی :** شیری شیرین وەکوو هەنگوێن.
**قەی :** ڕشانەوە.

* واتە : یارە جوانەکەم! باڵابەرزە جوانەکەت کە وەکوو نەخڵە، بەڵکوو لە نەخڵی هەڵبژێردراو جوانترینی پەی کردووە و لە ڕەونەقی خستووە و باڵاکەت لە مێچکە نەخڵە هەرە باشەکان بە دیمەنتر و ڕێکوپێکترە و هەنگی بێچزووی مەمکە جوانەکانت پڕە لە شیر و هاتووەتە ڕەگ، (ژنێك کە مەمکەکانی پڕ شیر بێت و هەندێ بە منداڵەکەی شیری نەدابێت، شیرەکە دڵۆپ دڵۆپ لە گۆی مەمکیەوە ئەتکێت. بەو حاڵەتە دەڵێن مەمکی هاتۆتە ڕەگ)، و دەزانم کە ئەو شیرەش لە هەنگوێن شیرینترە و ئەتوانم پێ بڵێم شەهدی سپی، هەنگوێنی چەرموو.

* * *

**(٥٥٢) سونبول لەبەر ڕوعوونەتی شمشادی تازە دا**
**هات و بە طەعن و دەورە بە سەریا شکایەوە**

**طەعن:** نەیزە و ڕم پیا کردن، خراپەی کەسێك گوتن، تانە لێدان، پیربوون، طاعوون گرتوو، ڕۆیشتن.
**دەور :** کات، زەمانە، نۆبەت، گەرمی، پەلکە (زوڵفی چنراو)، دەورادەور.
**ڕوعوونەت :** نادانی، تەکەبور، بلهی، ناسکی، نەرمی و سستی :

**نگردد عقدەهای من چرا هر روز مشکلتر**
**کە چون سرو از رعونت دست دایم بر کمر دارم.**
**«صائب تبریزی»**

* واتە : سونبول لەبەر نەرمی و ناسکی شمشادە تازەکە، واتە نەونەماڵەکەی شمشاد دەستی کرد بە ڕۆیشتن و بە دەوریا لوولی خوارد و خۆی

پێدا پێچاند.
(روعوونەت مەعنای کەم عەقڵی و نادانی ئـەدا. بـەڵام بـۆ دار و درەخـت کـەم عەقڵی ناگونجێ).

* * *

**(٥٥٧) برۆت تیغێکە وسمەی صەیقەل و مەسلوول و مووکارە**
**کە عیشوەی جەوهەرە، رەمز و ئیشارەی ئاوی مەودایە**

**ئاوی مەودا :** ئاسنگەر، پوڵا و تێخ و خنجەر و هەر شتێك تیژ بکاتەوە، دەیخاتە کوورە تاکوو ئامرازەکە سوور ببێتەوە، بە دوای سووربوونەوە ئەو ئامرازە پەرداخ دەکات و بە دوای پەرداخ و تیژ کردنەوە، دووبارە دەیخاتە کوورە، تا باش سوور ببێتەوە ئەوسا دەری دێنێ و ئەیکا بە ئاوا تاکوو سارد بێتەوە. بە ئەو کارە دەڵێـن ئاودان و ئاوکاری کردن.

* واتە : برۆت وەکوو تێغی تیژی ئاسکە کە بـە وسمـە زاخـاو دراوە و پەرداخ کراوە لە کێلان دەرهـاتووە و رووتـە و لـە تیـژی، مـوو دەکـات و بـە عیشوەش خاڵ و مێل دراوە کە بە یەك ئیشارە و برۆ هەڵتەکاندن دەمە تیژەکـەی کە وەکوو نشتەری ئاو دراوە، عاشقی بێچارەت لە بەر ئەو تێخـە تیـژە چـی لـە دەس دێ و دەبێ چ بکات؟

* * *

**(٥٥٨) لە سایەی کوفری زوڵفت، دڵ «فنا فی النور»ی ئیمانە**
**مەڵێن ظوڵمەت خراپە وەصڵی پەروانە لە شەو دایە**

«نالی» لە چوارینەکەی باباتاهیر کەڵکی وەرگرتووە کە دەڵێ :

**زدست دیده و دل هر دو فریاد**
**که هرچه دیده بیند دل کند یاد**
**بسازم خنجری نیشش ز فولاد**
**زنـم بـر دیده تا دل گردد آزاد**

**کوفری زوڵف :** تاریکایی، شەو.

* واتە : لە سایەی زوڵفە رەشەکەی یارە چون کەوتووەتە سەر رۆخساری گوڵی یار و داپیۆشیوە و ئیتر من نایبینم. کاتێك چاو شتێکی نەدی، دڵ نایهەوێ. ئەمنیش ئەگەر رووی یار نەبینم، ئیتر شەیدای نابم. جا دەڵێ کێ گوتوویە شەو خراپە؟ مەگەر لە شەودا نیە کە چرا رۆشن دەرکرێت و شەمع رۆشن دەبێ و پەروانە خۆی دەگەینێ بە شەمع و وەسڵی لە شەودایە.
کاتێ کە روخساری یار نەبینم ئیمانم مەحکەمترە.

* * *

**(٥٦٠) لە دووری تۆیە ئەی خورشیدی پڕتەوبەخشی سەرگەردان**
**کە «نالی» وا لە حاڵاتی میحاقی ماهی نەودایە...**

* واتە : ئەی خورشیدێ کە تەواوی مانگ و ئەستێرە و هەموو شەوگەردەکان، نوور لە تۆ دەگرن و تۆ مایەی رۆشنی هەموویانی، کە منیش یەکێکم لە ئەو شەوگەردانە. لەو کاتەوە نەمبینیوی رۆژبەرۆژ زیاتر ئەتوێمەوە. ئێستا وەکوو مانگی یەکشەوە لەرولاواز بووم.
هەروا کە دەزانین مانگ رووناکی لە خۆر دەگرێ و کاتێ عەرز دەکەوێتە نارای مانگ و خۆر، ئیتر مانگ چاوی ناکەوێتە خۆر و دیار نیە. ئەوەتە «نالی» خۆی شوبهاندوە بە مانگ، ئەویش مانگی یەکشەوە یان ئاخری مانگ. یارە جوانەکەشی شوبهاندوە بە خۆر. هەرچەند نێویکی لە بەدکار نەبردووە بەڵام دەبێ بەدکار بە زەوی شوبهێندرابێ کە هۆی کەم نووری مانگە.

* * *

**(٥٦١) فەرمووی بە مژەی مەستی، ئازانەوو تەردەستی**
**سادەی، لە دڵی سستی، تیرێ بە، تەمەننایە**

**تەردەست :** ئازاو زبر و زرەنگ.

* واتە : یارکە بە حاڵی من دەزانێ و باش دەزانێ کە چۆن گیرۆدەی بووم و لەبەرابەری دا چەندە بێهێز و سستم. خێرا فەرمانی دا بە برژانگی،

فەرمووی زوویە دەزانم کە زبر و زرەنگی و هەموو ویستم ئەوەیە تیرێك بـدەی لە دڵە سست و شەیداکەی. سادەی. واتە خێراکە و پەلەکە. ویستی «نـالی»یـش هەر ئەوەیە.

* * *

## (٥٧١) دڵڕفێنێکە لە بۆ مەدحی، سەراپایی ئەوێ
## واجبە مەدحی بکا هەرچی کەماڵێکی هەیە

**مەدح :** تاریف، پەسەن، هەڵدانەوەی چاکیەکانی کەسێك.

**کەماڵ :** تەواو بوون، دژی نوقسان (تەمام و کەماڵ)، گـەورەیی و سـەرکەوتن، عیلم و زانست،(بێکەماڵ : نەزان، کەماڵ: زانا و پسپۆڕ).

**سەراپایی :** سەرتاسەر، هەموو.

* واتە : یار دڵڕفێنێکە بۆ خۆی کە پەسەن و تاریفی سەرتا پـای دەوێ و پێویست و شایانە کە عاقڵان و باکەماڵان تاریفی بکەن. چونکوو کەسـێك کـە نەزان و بێکەماڵە ناتوانێ لە چاکیەکانی یارەکەم سەردەربێنێ.

* * *

## (٥٧٢) عاشقی بێدڵ دەناڵێ، مەیلی گریانی هەیە
## بێشکە هەورە تریشقە تاوی بارانی هەیە

دڵدار و دڵبەند بە مەعشووقە دەڵێن نە بە عاشـق. بـە تایبـەت عاشـقی بێدڵ کە دڵی لە دەستداوە و دڵدار بردوویەتی.

«نالی» دەڵێ :

* عاشقێك کە شەیدا بووبێ و دڵی لە دەس دابێ و دەستی کردبێتە ناڵین، وا دایارە دەیهەوێ بگریێ. دیارە کاتێك ناڵینم بوو، گریانیش هـا بـە شـوێنیەوە. هەروا کە لە بەهار دا کاتی هەورەتریشقە بگرمێنێ، بە دوای گرمەی هەور، بـاران

دەبارێ. بێشك هەروایە و ئەمنیش بە دوای ناڵە دەگریم.

* * *

**(٥٧٦) دڵ موشەببەک بوو لە بەر ئێشانی نیشاتی موژەت**
**حەیفە قوربان! ئاخر ئەم نیشانەیە شانی هەیە**

(بە بڕوای من، نیشانەیە لە نیشانەیی، باشتر مەعنا دەبەخشێ. کە من نیشانەیەم هەڵبژاردوە) .

دڵ ناوەندی مێهر و مەحەبەتە. جێگەی ئەوین وهیواو هومێدە، جێگەی ڕۆحی ئینسانیی و حەیوانی‌یە :

**« دل کان است خرد گوهر و قلم زرگر»**
**«ئیمام غەزالی»**
**«تا بتوانی زیارت دلها کن**
**کافزون ز هزار کعبه آمد یک دل»**
**«خواجەعبدالله انصاری»**

واتە : هەتا ئەتوانی زیارەتی دڵەکان بکە. چونکوو دڵ بە دەست هێنان لە هەزارجار حەج چوون و کەعبە زیارەت کردن باشترە. بە کورتی، دڵ جێگەو ماوای خودایەو شان و شکۆ لە ئەوە زیاتر نابێ.

* واتە : ئازیزەکەم! لەبەرچی بێڕەحمانە دڵە پڕ شان و شکۆکەی منت کردووە بە نیشانەو بە تیری برژانگە جوانەکانت داوتە بەر تیر و کونکونت کردووە؟ خافڵی کە ئەو نیشانەیە کە دڵی منی بەدبەختە، دارای شان و شکۆیە و مەنزڵ و جێگای خودایە و قەدر و مەنزیلەتی هەرە گەورەی هەیە و بێبایەخ نیە. بە قوربان حەیفە ئەو کارە خراپە مەکە.

* * *

**(٥٧٦) لەحظەیێک و لەمحەیێک چاوم بە چاوی ناکەوێ**
**کێ دەڵێ وەحشی غەزاڵە مەیلی ئینسانی هەیە!**

**لەحظە :** ماوەی چاو ترووکاندنێك.
**لەمحە :** ئەوەندەی برووسکە لێدانێ، واتە نەختێ.
**ئینسان :** مەردم، بەشەر، گلارە و بیبیلەی چاو، سەر ئەنگوست، سێبەر و سەری کێو، زەویی بایر و نەکێڵدراو، سێبەری خەڵك، کینایەیە لە ئونس و هۆگری، لێرە مەبەست لە ئینسان، ئونس و هۆگریە.
* واتە : خەڵکینە ئەوە بۆ هەر دەڵین ئەو ئاسکە وەحشیە دەیهەوێ هۆگری من بێت و هاونشینی من؟ ئاخر تا ئێستا تەنانەت بۆ ماوەی چاوتروکاندێکیش نەمدیوە. چۆن شتی وا ئیمکانی هەیە.

* * *

**(٥٩١) خوێنی صیرفە پێی سەر و دەستت حەنایی کردووە**
**رەنگی دەست و سەر نییە، رەنگی سەری دەستانییە!**

**صیرف :** خالیس، بێخەوش، رووت، تەنیا.
**دەستان :** ئاواز، دەنگی بولبول، بنماڵی و هێزمدان و جێگەی خڕوپڕ، ناوی زاڵ بابی رۆستەم، فروفێڵ و حیلە، ناوی جادووگەرێکە :
**«اگر دستان جادو زندە گردد**
**نیارد کرد با تو مکر و دستان»**
واتە : ئەگەر دەستانی جادووگەر زینوو بێتەوە، ناوێرێ دەگەڵ تۆ دا فروفێڵ بکات.
«نالی» رووی دەمی لە یارەکەیە، کە لە گەڵیا فروفێڵ دەکات، دەڵێ:
* سەرو دەستت وا بە رووتی حەنایی کردووە، پێت وایە نازانم چەندە بە مەکرو حیلەی؟ نا نا باش دەزانم. ئەو رەنگە، رەنگی دەست و سەر و خەنە نیە، ئەوە رەنگی جادووگەری و فێڵ و دەستانەکەتە! نانا، ناتوانی فریوم بدەی.

* * *

**(٥٩٥) واقیعەن خانەقە خۆشزەمزەمەییکی تێدا-**
**یە، بەڵا قەندی هەیە، گەندی هەیە، رەندی نییە**

**واقیعەن :** بە راستی.
**زەمزەمە :** هەرا و زەنا.
**گەند :** بۆگەند، و مرۆی بێکەڵك.
**قەند :** شیرین و پیاوچاك.
**رەند یان ریند :** فێڵباز و وشیار، سەرسەری و کەمتەرخـەم، توڵاشـەی چێـو، دارتاش، داری عوود، پێستی کوڵفت و زبری هەنار و مازوو، تایچەی لە بەرگـی خورما دروست کراو، هوشیار و وریا، زبر و زرەنگ کەسێ کە بتوانێ ریابازان و دووڕووەکان لە پیاو چاکان جیا بکاتەوە. کە مەبەستی «نالی» ئەو ریندەیە.
* واتە : خانەقا بە راستی خۆشە و بەزمەکەی جوانە، گەمـە و گاڵتـەی زۆری تێدایە. پڕە لە پیاوچاك و ریاباز و دووڕوو، بەڵام بەداخەوە ئەو رەندە، ئەو وشیار و زبر و زرنگەی کە بتوانێ چاکە و خراپە لێك جوێ بکاتەوە تێدا نیە.

* * *

**(٦٠٠) لە عەکسی ذاتی بێڕەنگت هەتا کەی دیدە رەنگین بێ**
**جونوونی لەیل و مەیلی نەقشبەندی عەکسی ئەسما بێ؟!**

**عەکس :** شێوە و وێنە لە نێو ئاو یان ئاوێنـــە، ژێـر و روو بـەروپشـت کـردن، وێساندنی وڵاخ، بەرپەرچ دانەوە، بەرگری کردن لە کـاری کەسێك، هۆنینـەوە، هەڵاتنی خۆر.
**بێڕەنگ :** تەرحی نەقاشی :

**«مـثـال بزم تو پرداخت نقشبند ازل**
**هنوز نازده نقش وجود را بیرنگ»**
**«ظهیر»**

واتە : هێشتا تەرحی بوون نەکێشرابوو کە نەقشبەندی ئەزەل، بەزمەکەی تۆی ساز کرد.
**بێرەنگ :** ساف و سادە، بێرەونەق رەنگ پەڕیو، خەمبار، زۆر سپی.

**ڕەنگین :** بە ڕەونەق، جوان و ظەریف، خۆش‌قسە، خۆش و باش، ڕەنگ کراو.
**جونوون :** داپۆشانی شەو، شاردراوە، شێتی، وەسوەسە، عاشق بوون.
**جونوونی لەیل :** تاریکی شەو یان ئێوارە.
**مەیل :** ویست و ئارەزوو.
**نەقشبەند :** وێنەگر، زەردۆز وگوڵدۆز، ڕازێنەر، خەمڵان.
**ئەسما :** جەمعی سەما(ئاسمان)،کورت کراوەی (ئەسماء)، جەمعی (ئیسم = نــاو)، ناونیان، بەرە و ژوور چوون، کردنەوە، بەرز کردنەوە، نێوی ژن و پیاو کــە لـێرە نێوی ژنێکە کە «نالی» ئەو پارچە شێعرەی بۆ گوتووە.
* واتە : ئەسما گیان! بە خــاتری وێنــە جــوان و ســاف و نازارەکــەت، هەتاکەی لە بەر پێ‌نەگەیشتنی تۆ، چاوم بە گریانی خوێناوی ڕەنگین بێ و خــوم شێت و شەیدا و ویست و ئارەزووم ئەوەبێت کە ڕازێنەری وێنە جوانەکەی تۆی خۆشەویست بم.

* * *

**(٦٠٢) گەهێ ئاهوو ڕەوش شاهی، گەهێ گەوهەرمەنش ماهی**
**بڵا با سینە صەحرا بێ، بڵا با دیدە دەریا بێ!**

**گەهـ :** کورت کراوەی گاهێ‌یە، واتە جارجار.
**ڕەوش :** تەرز، شێوە، ڕێگە ڕۆیشتن.
**مەنش :** خوو، سروشت.
* واتە : جارجار وەکوو ئاسکی و تــەرز و ڕۆیشــتنەکەت، شــاهانەیە. جارجاریش هەروەکوو گەوهەرێ کە لە نێو سەدەف دای لە بن زریا. ئێســتا کــە وایە با سینگم سەحرا بێت، بۆ ئەوکاتەکە وەکــوو ئــاهوویت و بــە لارولەنجــەی. چاوەکانیش بە بۆنەی فراوانی فرمێسك وەکوو دەریایە و جێگــە ماســی. ئینجــا ئازیزەکەم! وەرە باوش و سەر سینگم کە سەحرایە. یا بنە سەرچاوم کە دەریایــە و جێگەی ماسی‌یە.

* * *

**(۶۰۲) کەمەندی زوڵفی دوولانە لە بۆ گەبر و موسوڵمانە**
**دەکێشی بێموحابانە، چ لەم لا بێ، چ لەولا بێ!**

**بێموحابا :** بێترس وباك.

* واتە : زوڵفی پەلکەکراوی کە وەکوو کەمەندە، هەموو کەسێك بەرەولای خۆی رادەکێشێ. ئینجا ئەو کەسە چ گەبربێ و چ موسوڵمان، بێترس و باك دەیکێشێتە لای خۆی دا. جیاوازی لە ئارای گەبر و موسوڵمانی بۆ نیە. چ لەم لابێ(موسوڵمان). چ لەولا بێ(گەبر). هەر کەس بێت گیرۆدەی خۆی دەکات.

* * *

**(۶۳۲) بە ظاهیر طاوسی رەنگین، صیفاتی « تە علی التّاهی»**
**بە باطین قومری و، خاکستەری ذات و موجەررەد بێ!**

**قومری :** یا کەریم کە « یاکریم کامل الحروف»ە و باڵندەکەش خۆشەویست و موبارەکە.

**خاکستەری ذات :** بێفیز و دەمار.

هەروا کە لە شێعری سەردێرەوە دەردەکەوێ، «نالی» دەڵێ خوزگەم بە ئەو کەسەکە پیاو چاك و رەند و خوداپەرستە و خاوەنی ئەو تایبەتمەندیانە. لێرەش دەڵێ :

* دەبێ وەکوو طاوس جوان بە ظاهیر بە فیز و دەمار و خۆش‌نوما بێ. بەڵام لە دڵەوە وەکوو یاکەریم کە لە زیکری خودایە، بێفیز و دەمار بێ و خۆی لە کەس بانتر نەزانێ. هەرچەند لە مەنزەری خوداپەرەستی‌دا بانتر بێ.

* * *

**(۶۴۲) گەر بازی نەظەر بازی، لەم دەستە، نیگارەت چی!**
**بۆ یاری‌یو دەسبازی، لەم راو و شکارەت چی!**

**نەظەرباز :** چاو حیز، ئەوکەسەی کە دایم چاوی ها بە شوێن ژنانەوە.

**«صوفیان جملە حریفند و نظر باز ولی**
**زین میان، «حافظ» دلسوختە بدنام افتاد»**

واتە : سۆفیەکان هەمویان چاو حیزو ژنباز، بەڵام «حافظ»ی دڵسووتاویان بەدناو کردووە «نالی» دەگەڵ خۆیەتی و دەڵێ:

* ئەگەر وەك بازی شکاری داعە هایت بە شوێن شکارەوە و ئەوەندە چاوحیزی کە ناتوانی تەماشای ژنەکان نەکەی، ئەم دەستی نیگارە چیە ها لە نێو دەستت؟ (وادیارە دەگەڵ نازدارێك خەریکی دەسبازی‌یە)! ئەگەریش بۆ بازیە،ئەم راو کردنەت لە بەر چیە؟

* * *

**(٦٤٣) گەردەن کەچی زوڵفی بووی، سا دڵ مەدەبەر موژگان**

**وا خۆت لە تەناف داوە، ئیتر لە قەنارەت چی!**

هەروا کە لە شێعری پیشوودا وتوویە خەریکی دەسبازی بووە کە کەم‌کەم خەریکی عاشقی دەبی و خۆی دەڵێ :

* خۆت گیرۆدەی کردووە و لارە ملی زوڵفەکانی بوویت. سا دڵ مەدە بەر موژگانی، ئێستا کە خۆت گیرۆدە کردووە خۆت مەفەوتێنە. واتە لە سێدارە مەدە. ئەو شێعرانە لە ئەدەبیاتدا وردە کاریی جوانە. جاریَ وایە ئینسان خۆی دەکاتە باز، جاریَ شێر و جاریَ پڵەنگ کە مەبەستی نیهایی رێزەکاریەکەیە.

* * *

**(٦٤٥) واخوانی کە ناری من بۆ نوقڵی دەم و ماچە**

**ئەی لووتەخۆری تەکیە سا تۆ لە کەنارەت چی؟**

**واخوان :** بانگ کردنەوە، دووبارە ویستنەوە.

**کەنار :** ئامێز.

* واتە : دووبارە بانگ کردنەوەی من بۆ ئەوەیە کە لە ئامێزم گریَ و زارە وەك نوقڵە شیرینەکەی بژم و ماچی بکەم. لە ئامێزی یەکدا خۆش رابوێرین. یەکێك نیە بانگ بکاتە ئەو لووتە خۆرەی تەکیە و بڵێ ئەهای تیکە و پاروی زل، ئەتۆ حەددت چیە و تۆ لە کویَ و ئامێز گرتن لە کویَ؟ ئەتۆ شایستەی لە ئامێز گرتن نیت!

* * *

**(٦٤٥) بۆچ مایلی تەنهاییی؟ سەودایێکە خوڕاییی...**
**ئەی مەردومی بینایی، لەم کولبەیی تارەت چی؟**

**سەودا :** رەش، سەندن و فرۆشتن، شێتی، ئەندێشە و خەیاڵ و هەوەس، باتڵ و بێهوودە، عەشق.

**سەودایی خوڕای :** خەیاڵی باتڵ.

**کولبە :** ماڵی زۆر بچووك و بێبایەخ.

* واتە : لەبەرچی تەنیایی؟ خەیاڵێکی خاوە؟ ئەمن بە ئەو تەنیاییە خۆشم. چاوەکەم! ئەگەرتۆش، شەوکەلاوە کۆنەت پێخۆشە و تەنیاییەکەی من، فەرموو قەدەمت سەرچاو.

* * *

**(٦٤٩) مەغشووشی زەڕە، عاجیزی زیو، دەرهەمی دیرهەم**
**بۆچ تێکچووە صوفی کەرەبۆز بۆ غەمی باری؟!**

**مەغشووش :** تێکچوو.

**عاجیز :** داماو.

**دەرهەم :** تێكشکاو.

**کەرەبۆز :** ئەو صوفیە ریاکارەیە کە بە خاتری فریودانی خەڵك و خڕکردنەوەی زەڕ و زیو، جل و بەرگی سۆفیەتی کردووەبەر.

**غەمی بار :** غەمی گوناهی زۆر کە بە ئەستۆی گرتووە و بووەتە باری گوناهی.

* واتە : ئەو سۆفی‌یە کەرەبۆزەی گوناباره کە دایمە بۆ زێر تێکچووە و داماوی زیوە و تێك شکاوی دێرهەم و دینار و ماڵی دنیایە و خۆی لە کارە خراپەکەی خۆی ئاگادارە، لە بەرچی غەمباری گوناهیەتی.

* * *

**(٦٤٧) خەندەت بووەتە باعیثی گریانی دەمادەم**
**بەرقە، سەبەبی بارشی بارانی بەهاری**

خەندە کە سەبەبی گریان دەبێ و دەلیلەکەشی بەرق و بارانی بەهاریە. دەبێ بزانین موناسیبەتی خەندە (پێکەنین) و بەرق چیە. دیارە کە کاتی پێکەنین ددانە سپیە مرواریەکانی دڵدار دەکەوێتە دەرەوە و ئەدرەوشێتەوە و بریقەی دێ. بەرقیش کە بەرقە، جودا لە وردبینی وریزەکاری ئەدەبیەکەی، دەمانەوێ بزانین بۆ پێکەنینی دڵدار لە جیاتی خۆشحاڵ کردنی دڵدادە، سەبەبی گریانیەتی؟! شتی وا نابێ، مەگەر ئەو خەندەیە ریشخەن و گاڵتە پێکردن و تیتاڵی و مەکربازی بێت. کەوابوو، ئەڵبەت لێکدانەوەی مامۆستایش ناپەسەند نیە .

* واتە : بەسیەتی گاڵتە و، ریشخەنم پێمەکە. دەزانم ئەو پێکەنینی تۆوە مەکربازییە. من فریوت ناخۆم .

* * *

**(٦٥٥) یەک رەنگم و بێرەنگم و رەنگین بە هەموو رەنگ**

**بەم رەنگە دەبێ رەنگ‌رژیی عیشقی حەقیقی**

**رەنگ :** لەون، پڕ رەونەق، خوێن‌گەرم و خەڵك خۆشەویست، باشی و ناسکی، خەیانەت و ناراستی، مەکر و حیلە، خۆش‌قسە و خۆش بەیان(فصیح و بلیغ)، زۆر و قووەت، نەخش.

* واتە : یەك رەنگم. دووروو و ریاباز نیم. بێرەنگم و مەکرو حیلەم نیە. درۆزن نیمو خوێن‌گەرم و خەڵك خۆشەویست و باش و بێخەیانەت و قسە خۆش و نوکتەزان و راست و دروستم. ئەگەر تۆش ئەتەوێ بی بە پیاو چاك و مامۆستای راستی و دروستی و عەشقی راستەکی، وەکوو من بە.

* * *

**(٦٥٧) «برق البصر» لەبەر بەرق و تەلەئلوئی لەئالی**

**«خەسف‌القمر» لە ئیشراق قیامەتی جەماڵی**

**بەرق :** شەوق دانەوە.

**تەلەئلوء :** بریسکانەوە.

**لەئالی :** جەمعی لوئلوئە، واتە مرواری.

**ئیشراق :** هەڵاتن، دەرکەوتن.
**قیامەت :** ڕۆژی ئاخیرەت، هەستان، لە کوردیدا، زۆرباش خۆ نوادنن.(کوڕە دووێنی فڵانەکەس، شێعریکی خوێند، ئەوەندە جوان بوو ئیتر بڵێم چی؟ قیامەتی کرد). دەزانین کاتێ زەوی بکەوێتە بەین مانگ و خۆر، سێبەری زەوی دەبێتە هۆی مانگ گرتن( خسوف). بەڵام لێرە مەبەستی «نالی» خسووف بەو مەعنا نیە، چونکوو دەزانین کاتێ کە خۆر هەڵبێ، مانگ بەرچاو ناکەوێ. یەعنی ناتوانین ببینین. هەرچەند هەیە کە مەبەستی «نالی» ئەوەبێ.
* واتە : کاتێ یار دەستی کردە پێکەنین، شەوق و بریسکەی ددانە جوانە وەك مرواریەکانی، چاوی موڵەق کردم و کاتێ ڕوومەتی جوانی وەکوو خۆری هەڵات و خۆی نیشان دا، مانگ خۆی شاردەوە. واتە مانگ لە ڕەونەق کەوت.

* * *

**(٦٥٩) یەمی دیدە پڕ لە مەرجان، وەکوو یەشمی ئابدارە**
**شەبەیە شەبیهی زوڵفی سیاهی وەکوو زۆخاڵی**

وەك یەشمی ئابدارە، وەزنی شێعرەکە تێك دەچێ. وەکوو، باشترە.
**یەم :** دەریای بێبن و زۆر قووڵ، دەریا، ڕۆخانە و جۆبار.
**مەرجان :** جانەوەرێکی سوور لە بن دەریا، بە شکڵی گیا و درەخت کە پاش دەرهێنانی لە دەریا، لە جەواهیر فرۆشی و جەواهیرسازی دا بە خەڵکی دەفرۆشن و بە قیمەت و پڕبایەخە.
**یەشم :** بەردێکی سەوزی ڕەشتاوەیە، واتە سەوزی مەیلەو ڕەش.
**ئابدار :** پڕئاو، تەڕ، زۆر بریقەدار و بە ورشە، مێوەی پڕئاو و شیرەدار، تیژ و بەبڕش بۆ شمشێر و خنجەر، ڕەوان و خۆش بۆ شێعر، سەخت و پڕ مەعنی بۆ قسە.
زریای دیدە کە مەبەست لە چاوە جوانەکانی یارە. بۆ ئەوەی کە مەرجانی

تێبگونجێنێ کردوویەتـە دەریـا. چونکـوو جێگـای مـەرجان، دەریایـە. دیـارە ئەوکەسەی کە «نالی» تەعریفی دەکات، چـاوی جـوانی شینی هەیـە و نوختـە نوختە خاڵی سوور لە چاوی دایە. بۆیە دەڵێ پڕ لە مەرجان و بریقەدارە وەکـوو یەشم. زوڵفیشی وەکوو زوخاڵ رەشە، شەبیهی شەوەیە.

* * *

**(٦٦٢) بنوارە نەوبەهار و فوتووحاتی گوڵشەنی**
**گوڵزاری کردەوە کە دەمی غونچە پێکەنی**

**نەوبەهار :** ئەوەڵی بەهار .

**فوتوحات :** جـەمعی فوتـوح، ئـەوەڵین بـارانی بـەهاری، وشـترێك کـە کـونی گوانەکانی گوشادتر و ئاوەڵاتر بێت. کردنەوە، کرانـەوە، دەسـتکەوتی زیـاتر لـە ئەوەی کە ویستمان ببێت،(بەرەکەت). بە واتای شارگەڵێك کە بە جـەنگ داگـیر کراێ. کە لێرە ئەوەڵین بـاران و بەرەکـەتی مەبەسـتە بـۆ گەشـەدانی گوڵشـەن و گوڵزار.

گوڵشەن و گوڵزار : ئەو باخ و باخاتە یان ئەو دەر و دەشتە کە پڕ بێ لە گـوڵ و بە گوڵ، رازاوە بێت.

**پێکەنینی خونچە :** یانێ گوڵ دەم بکاتەوە.

* واتە : تماشاکە چەندە خۆشە کاتی نەوبەهار، بە ئەوەڵین بارانەکانیەوە و خەیر و بەرەکەتەکەیەوە بۆ گوڵشەن وگوڵزارەکان کە هۆی کردنەوەی خونچـە و دیەنی گوڵ و پشکەوتنی گوڵە.

* * *

**(٦٦٨) طاغیو یاغیو و باغی گوڵ نەیرەنگ و فەنی**
**شاد و شادابە بە گوڵ ئاتەشیو نارەوەنی**

**طاغی و یاغی :** سەرکەش، ستەمکار و لە خودا نەترس.

**نەیرەنگ :** فەن و فێڵ.

سەردەرچووی، گۆرانی زۆرخـۆش، فروفێـل، لم و وریـایی، تـاراندن، لـە بـیر بردنەوە، درەنگ دانەوەی قەرز.

**گوڵ ئاتەشی :** گوڵی سوور.

**«بـر گـلبـنـان گنـبـد اخـضـر نـهاد او**
**گلهای گونه گونه ز خیری و آتشی»**

واتە : لە سەر بتە و بنچکی ئاسمانی شین، گوڵگەڵێکی جۆراوجـۆر لـە گوڵ هێرۆ و گوڵیسووری داناوە.

* واتە : سەرکەش و ئەستەمکار و لە خودانەتەرسە و پڕ فەن و فێـل، دڵی خۆشەکە باغ و بێسانی هەیە کە پڕە لە گوڵی سووری جوان و دارە پڕشـاخ و بەرگەکەی نارەوەن.

* * *

**(٦٦٩) من وەکوو رەعدم و تۆ وەک گوڵ و سەبزەی دەمەنی**
**من دەگرییم و دەناڵێنم و تۆ پێدەکەنی**

**دەمەن یان دیمەن :** سەر سەلوێنك، گەنیو بـوون و رەشـەوە بـوونی خورمـا، رقاوی بوون، شیاکە، دوژمنایەتی، دەشت و سارا کـە لـێرە مەبەسـت دەشـت و سارایە* واتە : من وەکوو هەورە تریشقە، دەناڵێنم و دەگرییم. بـاران دەرژێنمـە سەر دەشت و ساراوە تاکوو سەوزە و گوڵ و گیا و درەخت سەوز بێـت. گـوڵ پێبکەنێ و گەشە بکات. ئەوەتە کە گریانی من، دەبێتە هۆی پێکەنینی تۆ. ئـەمن خوشحاڵی تۆم مەبەستە. هەرچەند بە گریانی من بێت.* * *

**(٦٧٠) تەنی راضی بە خەشین پۆشیی وەک شێر و شوتور**
**بێنـیـازە لـە بـرێشـم تـەنـی و پـیلەتەنی**

**شێر و شوتور :** لە فارسیدا مەسەلێك هەیە کە کـاتێك دەیانـەوێ کەسێك یـان شتێك نەبینن و ئیتر چاویان پێنەکەوێ و هیچ نیازێکیان پێنـەبێ، ئـەڵێن: «نـە

شیر شتر نە دیدار عرب». بە ئەولێکدانەوەیە زانیمان کە شیر و شــوتور یـەعنی بێنیازی.
**برێشم تەنی :** جل و بەرگی ئاورێشمی لە بەر کردن.
**پیلەتەنی :** پیلە دروست کردن، ئاورێشم چنـین، بـە ئـەو کرمـە دەڵێـن کرمـی هەورێشم، ناوی دیکەی «پیلەتەن»ە.
* واتە : چونکوو لەشی من فێرە بە جل و بەرگی زبر و پەشمینە، لە جل و بەرگی نەرم و نوڵ و هاورێشمی بێنیازم و ئەو جل و بەرگەم ناوێ.« نە شـیر شتر، نە دیدار عرب».

* * *

**(٦٧٤) چونکە «نالی»! لە سەر ئەم ئەرضە، غەریبی وەطەنی**
**هەستە باری مەدەنی بە، مەدەنی بە، مەدەنی.**
**باری :** جارێك دەسکەم، خودای تەعالا، (لێرە مەعنای دەسکەم ئەدا ).
**مەدەنی :** مردەنی، پیاوی بێهێز، نزیکەوە بوون، نزیکەوە کردن، خۆش طـەبع و خۆشقسە، خاوەنی سەلیقە، تێگەیشتوویی و خەڵکی شار دژی دێهاتی، شـاری دانیشتووی شار.
*واتە : «نالی» ئەتۆ کە غەریبی و خەڵکی ئێرە نیت، هەستە هیمەت بـە خـەرج بـدە. دەسکـەم خـۆش قســە و خـاوەنی سـەلیقە و تێگەیشـتوو بـەو نزیکەوکەرەوە و «موتەمەددن» بە. خەڵکی شاری : دوژمنێ لەناوبەرە.

* * *

**(٦٧٦) دو جادوو ماری مەغزی ئادەمی خواری قەرار داوە**
**بە سەرشانی، وەکوو ضەححاک و، ناوی ناوە زوڵفەینی**
* واتە : قژ و زوڵفە جوانەکەی لوول کردووە و کردوویــە بــە دوو دانــە پەلکە و خستوویە سەرشانی. هەرکامیان بەسەر شانێکیا، هەر وەکــوو مــارە بـە ناوبانگەکانی سەر شانی زەححاك، کە مێشکی ئادەمیزادەیـان دەخـوارد. ئێسـتا

ئەم مارانە، ئەم پەلکانەش، مێشکی دڵدارانی خواردووە و گێــج و وڕ و لــە خــۆ بێخەبەر و شێت و شەیدایانی کــردووە. تــازە هــاتووە و دەڵــێ ئەمانــە زوڵفــن، ناویانی ناوە بە زوڵف.

* * *

**(٦٧٨) وەکوو دوودی سیاهە ئاهی «نالی» و ئەم رەقیبانە**
**لە سەر تاپێ لە بەرگی مەرگ و ماتەم ناوە زوڵفەینی**

**رەقیبانە :** وەکوو رەقیب(سەردانە، شێرانە و ...).

**بەرگی مەرگ :** کفن سپیە نە رەش.

*واتە : ئەم دڵدارەی من وەکوو رەقیبەکەم، وەکوو بەدکارەکەم، ئــەوەندە رقی لە منە و ئەوەندە بەر پەرچی منە، دەزانێ کە ئاهی من ئەوەندە رەشە و هــەر وەکوو دووکەڵی رەشە، کەچی ئەو زوڵفە رەشە بۆن خۆشەکەی کفەن کــردووە و بە سەرپۆشی سپی داپۆشیوە و شاردوویەتەوە. واتە بە بەرگی سپی داپۆشیوە.

* * *

**(٦٨٣) هەوای سەیری بەڕ و بەحر، ئاگری بەرداوەتە عومرت**
**کە تۆزێ مونعەقید خاکی، دڵۆپێ مونجەمید ئاوی**

**تۆز :** خاك.

**خاکی مونعەقید :** بەرد، (بەرد بە هۆی فشاری تووژەکــانی جــۆر بــە جــۆری زەوی دروست دەبێ).

**دڵۆپی مونجەمید :** یەخ.

* واتە : ئارەزووی گەشت و گێڵ و ســەیرانی وڵاتــان و تەماشــاکردنی وشکی و دەریا هەڵی خڕاندووە و ئاگری بەرداوەتە عومرت. ئەوەندە بــەرزەفڕ و خۆ نوێن مەبە. راستە کە بەنیئادەم لە خاك دروست بووە. بەڵام تۆ ئەو خاکــەی کە بووەتە بەرد. واتە دڵڕەق و بەفیزی. ئەگەریش ئاوی، ئەو ئاویتە کــە بووەتــە

سەهوڵ. واتە ناو چاو تاڵ و رووگرژ و بێفەڕی. (بە ئینسانی رووگرژ ئەڵێن لە یەخ دەکا).

* * *

**(٦٨٣) کە خاکی، خاکی دامەن بە، وەگەرنە تۆزی بەر بادی**
**کە ئاوی، ئاوی گەوهەر بە، وەگەرنە بڵقی سەر ئاوی**

**خاکی دامەن :** خاك دامەن، دژی تەڕدامەن و ژنباز، واتە چاوپاك و پیاوباش.
**ئاوی گەوهەر :** ئەو قەترە بارانەی کە لە دەریا دەچێتە سکی سەدەف و دەبێتە مرواری.

* واتە : ئەگەر خۆت بە خاك دەزانی، بێدەمار و پیاو چاك و چاوپاك بە. ئەگینا وەکوو تۆزێکی کە با دەتبا و بە فیڕو دەچی و گونابار و ئاخرشەڕ دەبی. ئەگەریش ئاوی، واتە توند و عەسەبانی‌یە. بڵقی سەر ئاوی و بە فوویەك دەتۆقی و لە نێو دەچی. باش ئەوەیە وەکوو ئەو قەترە بارانە بی، کە دەبێتە گەوهەر و مرواری. مەبەست لە ئەو شێعرە پەرە پێدانی حیسی ئینسانەتیە.

* * *

**(٦٩٩) دنیاکە گوڵگوڵی بووە، قوربان! ئەتۆش وەرە**
**طالیب بە گوڵ بە، قەیدی چییە گوڵ،گوڵی بوێ؟!**

**گوڵگوڵی :** رەنگاورەنگی شتێك بە جۆرێ کە لە هەر جێگە و شوێنێکدا رەنگی هەبێ، قاڵی گوڵگوڵیە، گوڵزار گوڵگوڵیە؛ زەردە، سوورە، شینە، هەموو رەنگێکی هەیە.

* واتە : ئازیز! بەهارە، دنیا پڕ بووە لە گــوڵ، دەشــتودەر گوڵگوڵــیو ڕەنگاوڕەنگە، هەموو جــۆرە گوڵێــك هەیــە. ئــەتۆش کــە خــۆت گوڵــی، گــوڵ خۆشەویست بە. قەیدی چیە کە تۆ بە بۆنەی گوڵ بە دەستەوە گرتــن و لــە نێــو گوڵدا بوون وەکوو دەشت و دەر گوڵگوڵی بی.

* * *

**(٧٠٠) «نالی»! زوبانەکەی تەڕو پاراوی سەوسەنت**
**حەیرانی چاوی نێرگسە، وەک لالە نادوێ!**

دەزانین سەوسەن، بە تایبەت سەوسەنی ئازاد، دەهـ زوبانی هەیە:

**«در بوستان جاه تو شد بندە سوز نی**
**با دە زبان چو سوسن آزاد مدح خوان»**

* واتە : سۆزی نەی بۆ مەدحی تۆ، هەروەکوو سەوسەن دەهــــ زوبــانی هەیە. نێرگس دایە مەخموورە، واتە خەواڵووە. لالەش دایــــە ئاوەڵــا و خەندانــە. نێرگس سیفەتی چاوی خومارە و سیفەتی لالەش ئاوەڵا و دەم پێکەنینە.
«نالی» بە خۆی دەڵێ :
* ئەرێ ئەوە بۆ زوبانە تەڕ و پاراوەکەت کە وەکوو سەوســــەنی زوبــان دارە، حەیران ماوە و وەکوو نێرگس خەوی لێکەوتووە؟ بۆ وەك لالە پێناکەنی و خەندان نیە و شێعر ناڵێ بە باڵای یاردا؟

* * *

**(٧٠٢) عەشق سوڵطانێکە هەرگا ڕوو لە وێرانێ بکات**
**ئاهی سەرد و ئەشکی گەرم و قەلبی بوریانی دەوێ**

دەزگای فەرمانڕەوائیەکەی لە ناو بڕوا و ڕوو بکاتە وێرانی، جگە لە ئاهی ســەرد

دەزگای فەرمانڕەوائیەکەی لە ناو بڕوا و ڕوو بکاتە وێ
رانی، جگە لە ئاهی سەرد و فرمێسك و جگەرسووتان،کارێکی دیکـەی بۆ ناکرێ. عەشقیق وایە. ئەگەر مەعشووق نەما و دڵی دا بە کەسێکی تـر، جگـە لە ئاهی سەرد و فرمێسك و جەرگی کەباب، شتێك بۆ عاشق نامێنێ.

* * *

**(٧٠٧) تاچاکی نەکەی پڕ لە هەوا سینەیی «نالی»**
**وەک زەنگڵە ئاوازەیی ناڵەی دڵی نایێ**

**زەنگڵە :** هەمبانەیەك کە دووزەلەیەکی پێیەوە بەسترابێت. هەمبانەکە پڕئەکەن لە با، ئەوکەسە کە فووی تێ دەکا لە کاتی بینگ خورادنەوە دا بە دەست هەمبانەکـە ئەگووشێ، تاکوو دووزەلەکە لە دەنگ نەکەوێ. بە ئەو دووزەلە و هەمبانە دەڵێـن زەنگەڵە یان زەنگڵە. کە ئێستاش لە باشووری ئێراندا بە تایبەت لـە بووشـێهر و ئەو مەڵبەندە باوە.

«نالی» دەڵێ :

* سینەی من وەکوو ئەو زەنگڵەیە تا چاك پڕ نەبێ لە هەوا، واتە تا ئـاخ هەڵنەکێشم و سینگم پڕنەبێ لە هەوا، ناڵەم دەر نایێ.

* * *

ئەو لێکوڵینەوە و ساغ کردنەوە، چەند جار درێژەی کێشا. چونکوو هەر جار بە دوای چاو لێ خشاندنێک هەڵەیەکتر دەکەوتە بەرچاوم.کە ناچار بووم دووبارە پێدابیێمەوە کە دووبارە چەند هەڵەی ترم دەدۆزیەوە. ئەو کارە بوو بە هۆی ئەوەی کە ئەم کارەم درێژ خایەن بێت.

ئێستاش دەڵێم پێم وایە کە هێشتا هەڵەی ماوە کە ئەگـەر زانایـان و ئەدیبان چاوی پیا بخشێنن، ئەو دیوانە باشتر شەرح دەکـرێ و لـە ئـەنجامدا دیوانێکی پاک و پوختە دەکەوێتـە دەسـتی خـەڵک، بـە بۆنـەی ئـەو کـارەوە دیوانەکەم بەیەک جار نەنووسی.

**٢۴ ڕێبەندانی ساڵی ١٣٧٧ کۆچی هەتاوی.**

**علی محمد رضاوندی (باپیر).**